



حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە - بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# بیرکاری بۆ هەمووان

## کتێبی قوتابی

### پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی - بەرگی یەکەم



چاپی هەشتەم
٢٠١٦ز/٢٧١٦کوردی/ ١٤٣٧ک

# ناوەڕۆك

## ١ ژمارەكان
## Numbers



## ٢ كۆكردنەوە و لێدەركردن
## Adding and Subtracting

# ٣ بڕەکان و کردارەکان
## Expressions and Operations



# ٤ چارەسەرکردنی پێدراوەکان
## Data Analysis



# لێکدانی ژمارەکان
## Multiply Numbers





# دابەشکردنی ژمارە سروشتییەکان
## Divide Natural Numbers



# دابەشکردنی ژمارە دەییەکان

## Divid Decimals





# سەلمێنراوی ژمارەکان

## Numbers Theory

# ٩ کەرتەکان و ژمارە کەرتدارەکان

## Fractions and Mixed Numbers



# ١٠ کردارەکان لەسەر کەرتەکان

## Operations With Fractions

# ١١ ئەندازە
## Geometry



# ١٢ پێوان
## Measurement

# ١٣ ڕێژەی سەدی و ژمارە تەواوەکان

## Integers and Percent

بەشی ١

# ژمارەکان
# Numbers

هەڵاڵەی گوڵەکان لە دروستکردنی دەرماندا بەکاردێن. لە جیهاندا ناویان لێناوە بە یەکەم خۆراکی دروست. هەڵاڵە لە باشترین و بەهاترین جۆرە، چونکە هەموو بنەماکانی پێویست بۆ سیستەمی خواردەمەنی هاوسەنگی تێدایە.

**پرسیارێك بۆ شیکار** کام دەنکە هەڵاڵە لەوانەی کە لە خشتەکەدا هاتووە بچووکترە؟

| پێوانی دەنکە هەڵاڵە | |
|---|---|
| جۆری هەڵاڵە | پێوانەکەی |
| زەنبەقی گەورەی ئاو | ٠,٠٢ سم |
| نەفلی وەنەوشەیی | ٠,٠٠٠٢ سم |
| گوڵە بەهارە | ٠,٠٠٢٥ سم |
| گوڵی لووتە گۆلك | ٠,٠٠١٥ سم |


هەلاڵەی زەنبەقی گەورەی ئاو



نەفلی وەنەوشەیی و هەلاڵەکەی



گوڵە بەهارە و هەلاڵەکەی



گوڵی لووتی گۆلك و هەلاڵەکەی

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

| |
|---|
| بەدرێژی expanded form |
| ڕەنووسەکان digits |
| فاریزەی دەیی decimal point |
| نووسین بە ڕەنووس writing in digits |
| ژمارەی تەواو integer |
| ژمارەی دەیی decimal numbers |
| هاوتان equivalent |

## زاراوەکان

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ژمارە ٤+٣٠+٥٠٠ بە ___؟___ نوسراوە.

٢ هێماکانی ٠، ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩ پێیان دەووترێت ___؟___ .

٣ لە ژمارەی دەییدا بە ___؟___ یەکان لە خانەکانی دەیی جیادەکرێتەوە.

٤ ژمارە دەییە هاوتاکان لەگەڵ ئەو ژمارانە___؟___ کە مانای هەمان هێندە هەیە.

٥ ئەو ژمارەی ڕنووسێك یان زیاتری لە لای ڕاستی فاریزەکەوە هەیە پێیدەووترێت ___؟___ .

## بەهای خانەیی

بەهای ڕەنووسی شین لە هەریەك لەم ژمارانە بنووسە.

٦ ٤١٨   ٧ ١٢ ٣٠٠   ٨ ١٠٨ ٥٤٣   ٩ ٥١٢ ٥٧٠

١٠ ٨٩١ ٥٦٣   ١١ ٢٠ ٤٥٦   ١٢ ٦ ٢٥٧   ١٣ ٩٢ ٥١٦ ٧٨٢

## خوێندنەوە و نووسینی ژمارەکان

ژمارەکان بە ڕەنووس بنووسە.

١٤ هەشتا و حەوت هەزار و چل و دوو

١٥ ٢٠ ٠٠٠ + ٣ ٠٠٠ + ٥٠ + ٦

١٦ چواردە و سێ دەیەك «چواردە و لەدەیا سێ»

١٧ ٣ ٠٠٠ + ٢٠ + ٧ + ٠,٢

ئەو ژمارە دەییە بنووسە کە بەشە ڕەنگکراوەکە دیاردەکات.

١٨   ١٩   ٢٠



ژمارەکە بەشێوەی درێژی بنووسە.

٢١ ٢ ٤١٢   ٢٢ ٣٨٧   ٢٣ ١٣ ٠٨٧   ٢٤ ٣٥ ٩٠٢

ژمارەکە بەشێوەی پیت بنووسە.

٢٥ ٤٠٩   ٢٦ ٥ ١٠٢   ٢٧ ١٤ ٠١٣   ٢٨ ١٦ ٨٧٠

وانەی ١

# ملیۆنان و ملیاران
# Millions and Billions

**پێداچوونەوەی خێرا**

١) ٢٠ × ١٠
٢) ٣٨٠ × ١٠
٣) ٤٤ × ١٠
٤) ٤ ٨٣٠ × ١٠
٥) ١٦ ٩٠٠ × ١٠

**زاراوەکان**

ملیار billion

## فێربـــــــە

نزیکەی یەك ملیۆن کەس لەسەر ڕێگا و کەنارەکانی ویلایەتی فلۆریدای ئەمریکا، بۆ چاودێری هەڵدانی ئەپۆلۆی ١١ کۆبونەوە. ئایا پێویستیت بە ١٠٠ تۆری چوارگۆشەیی (١٠×١٠) زیاتر یان کەمتر هەیە، بۆ نواندنی ملیۆن؟ ئەمە ڕوونبکەرەوە.
نزیکەی ٧٢٦ ٣٠٠ ٠٠٠ کەس، نیل ئارمسترۆنغ یان بینی کاتێ یەکەم هەنگاوی نا لەسەر ڕووی مانگ، دەتوانرێ ئەم ژمارەیە لە خشتەی خانەکاندا تۆماربکرێت.

| ملیۆنان | | | هەزاران | | | یەکەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان |
| ٧ | ٢ | ٦ | ٣ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |

**نووسین بە ڕەنووس:** ٧٢٦ ٣٠٠ ٠٠٠

**نووسین بە درێژی:**

٣٠٠ ٠٠٠ + ٦ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٢٠ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٧٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠

**نووسین بەپیتی:** حەوت سەد و بیست و شەش ملیۆن و سێ سەد هەزار.



کەشتی ئاسمانی ئەپۆلۆی ١١ لە ١٦ی تەمموزی ساڵی ١٩٦٩ زەوی بەجێهێشت. یەکەمین کەشتی ئاسمانی بوو کە سەرنشینانی لەسەر ڕووی مانگ دابەزین.

### ملیاران

شازادە سلطان کوری سلمان یەکەمین گەشتەوانی ئاسمانی عەرەبیە. بەشداری لە گەشتی کەشتی ئاسمانی دیسکۆڤەری لە بەرواری ١٩٨٥/٦/١٧ کرد. گەشتەکە زیاتر لە ٧ ڕۆژی خایاند.
گەشتەکە زیاتر لە ١٩ ٤٠٧ ١٣٤ ٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی تێچوو.
**ملیار** بریتییە لە ١ ٠٠٠ ملیۆن.

| ملیاران | | | ملیۆنان | | | هەزاران | | | یەکەکان | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان | سەدان | دەیان | یەکان |
| | ١ | ٩ | ٤ | ٠ | ٧ | ١ | ٣ | ٤ | ٠ | ٠ | ٠ |

**نووسین بە ڕەنووس** : ١٩ ٤٠٧ ١٣٤ ٠٠٠

**نووسین بە درێژی** : ٤ ٠٠٠ + ٣٠ ٠٠٠ + ١٠٠ ٠٠٠ + ٧ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٤٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٩ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠
+ ١٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠

**نووسین بەپیتی:** نۆزدە ملیار و چوارسەد و حەوت ملیۆن و سەد و سی و چوار هەزار.

## ساغبکەوە

**١** نووسین بەپیت بۆ ژمارە ٣ ٤٥٠ ٦٣٢ لەگەڵ نووسین بەدرێژی بەچی لەیەکدەچن؟ بەچی لەیەکتر جیاوازن؟

**٢** ژمارە سی و سێ ملیۆن و دوو سەد و حەوت هەزار و دوازدە بە ڕەنووس بنووسە.

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هەر ژمارەیەك بە ڕەنووس بنووسە.**

**٣** بیست و یەك ملیۆن و یازدە هەزار و دوو سەد و دوازدە.

**٤** پەنجا و پێنج ملیار و دوو ملیۆن و سەد و شانزە هەزار و حەفت.

**بەهای ڕەنووسی شین بۆهەر ژمارەیەك بنووسە.**

**٥** ٣٥ ٤٢٧ ٢٣١    **٦** ٧٨٠ ٩٠٤ ٦٥٢    **٧** ٩ ١٢٤ ٤٣٢ ٢١٢    **٨** ١٤ ٩٥٦ ٦٣٠ ٢١٠

**لەکام لەم دوو ژمارەیە ڕەنووسی ٧ بەهای خانەی بەرز دیاری دەکات؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.**

**٩** أ ١٧ ٨٥٤   ب ١٠٥ ٠٧٩

**١٠** أ ٧ ٠٨٩ ٠٠٠ ٠٠٠   ب ٧ ٠٨٩ ٠٠٠

**١١** أ ٧٥٠   ب ٧٥٠ ٠٠٠

**١٢** نووسینی ژمارەکە بە پیتی تەواوبکە. ٢ ٩٨٤ ٠٥٢ ٦٨١

دوو ملیار و ___؟___ و هەشتا و چوار ملیۆن و پەنجاو دوو هەزار و ___؟___ و هەشتا و یەك.

**تەواوبکە.**

**١٣** ١+٥٠ + ▢ + ٦٠ ٠٠٠+٥٠٠ ٠٠٠+١ ٠٠٠ ٠٠٠ + ٧٠ ٠٠٠ ٠٠٠ + ▢ +٥ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ = ٥ ٣٧١ ٥٦٠ ٨٥١

**هەر ژمارەیەك بە دوو شێوەی تر بنووسە.**

**١٤** دوو ملیۆن و سێ سەد و شەش هەزار و پانزە.

**١٥** ١+١٠٠+١٠ ٠٠٠+١٠ ٠٠٠ ٠٠٠+١ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠

**بەکارهێنانی پێدراوەکان خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیاری ١٦ و ١٧**

| دووری لە خۆر | |
|---|---|
| هەسارە لە سیستمی خۆریدا | ناوەندی دووری لە خۆر (کم) |
| عەتارد | ٥٧ ٨٧٠ ٠٠٠ |
| زەوی | ١٤٩ ٥٠٠ ٠٠٠ |
| نبتۆن | ٤ ٤٩٥ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| بلۆتۆ | ٥ ٨٩٦ ٠٠٠ ٠٠٠ |

**١٦** کام هەسارەیە نزیکەی ٦ ملیار/کم لە خۆرەوە دوورە؟

**١٧** هەسارەی نبتۆن نزیکەی چەند ملیار/کم لە خۆرەوە دوورە؟

**١٨** **هەڵە لەکوێدایە؟** توانا ووتی ژمارە ٢٠ ٠٠٠ ٢٠٠ دوو ملیۆن و دووسەد هەزارە؟ هەڵە لەکوێیدایە؟ نووسینی ژمارەکە بە پیتی ڕاست بکەوە.

**١٩** **ڕێنوێنی** بچووکترین ژمارە لە ٩ ڕەنووس پێکهاتبێ وڕەنووسەکان دووبارە نەبووبنەوە کامەیە بەهای خانەیی ڕەنووسی ٢ لەو ژمارەیە چەندە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**بەهای ڕەنووسی شین چەندە؟**

**٢٠** ٧٣ ٢١٥    **٢١** ٦٧٨ ٦٢١

**لەهەر بەستەیەك ١٠٠ پارچە دراو لە جۆری ٥٠٠ دیناری هەیە.**

**٢٢** چەند پارچە ٥٠٠دیناری لە ١٠ بەستەدا هەیە؟

**٢٣** چەند بەستە بەرامبەر ٥٠ ٠٠٠ دینارە؟

**پیتی گونجاو بۆ ژمارەکان هەڵبژێرە کە شێوازەکە تەواودەکات.**

**٢٤** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ٩، ١٢، ١٥، ١٨

أ ١٩، ٢٠، ٢١    ج ٢٠، ٢٣، ٢٦

ب ٢١، ٢٤، ٢٧    د ٢٣، ٢٥، ٢٧

# ڕیزکردنی ژمارەکان

## Ordering numbers



**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای ڕەنووسی شین چەندە؟

١ ٦٠
٢ ٤ ٢٦٠
٣ ٥ ٢٥٩
٤ ٢ ٨٥٤
٥ ١١ ٤٦٣

**لە بیرتبێ**

لەسەر هێڵی ژمارەکان. ئەو ژمارانەی کە لەلای چەپن بچووکترن لەو ژمارانەی کە لەلای ڕاستن.

### فێربە

گریمان کۆمپانیای ئاسیاسێل ٥٦ ٩٤٦ سیم کارتی لەماوەی ساڵێکدا فرۆشت. وە لە کۆمپانیای کۆڕەك ٥٦ ٨٠٣ سیم کارتی فرۆشت. کام لەم دوو کۆمپانیایە زۆرترین ژمارەی فرۆشتووە؟ دەتوانی هێڵی ژمارەکان بەکاربهێنی.




### نموونە

ڕەنووسەکان لەهەر خانەیەکدا بەراوردبکە. دڵنیابە لە جیاوازیان.

**هەنگاوی ١**

دەیانی هەزاران بەراوردبکە

٥٦ ٩٤٦
↓ یەکسانن
٥٦ ٨٠٣

**هەنگاوی ٢**

هەزاران بەراوردبکە.

٥٦ ٩٤٦
↓ یەکسانن
٥٦ ٨٠٣

**هەنگاوی ٣**

سەدان بەراوردبکە

٥٦ ٩٤٦
↓ ٨ > ٩
٥٦ ٨٠٣

کەواتە، ٥٦ ٨٠٣ > ٥٦ ٩٤٦

لەبەر ئەوەی ٥٦ ٩٤٦ < ٥٦ ٨٠٣ کەواتە کۆمپانیای ئاسیاسێل سیم کارتی زۆرتر لە کۆمپانیای کۆڕەك فرۆشتووە.

### نموونەی تر

ژمارەکان لە گەورەوە بۆ بچووك ڕیزبکە: ٨ ٤٢٠ ٠٠٠؛ ٨٥٢ ٤١٩؛ ٨ ٥٧٢ ١٣٤

ملیۆنان بەراوردبکە

٨ ٤٢٠ ٠٠٠
٨٥٢ ٤١٩ ٨ > ٠
٨ ٥٧٢ ١٣٤

ملیۆن نیە لە ٨٥٢ ٤١٩ دا

کەواتە ٨٥٢٤١٩ بچووکترین ژمارەیە.

دوو ژمارەی تر بەراوردبکە

٨ ٤٢٠ ٠٠٠
↓ ٥ > ٤
٨ ٥٧٢ ١٣٤

کەواتە

٨ ٥٧٢ ١٣٤ > ٨ ٤٢٠ ٠٠٠

کەواتە ٨ ٥٧٢ ١٣٤ > ٨ ٤٢٠ ٠٠٠ > ٨٥٢ ٤١٩

**لەبیرت نەچێ** بۆ بەراوردکردن و ڕیزکردنی ژمارەکان، لە چەپەوە دەستپێبکە و لەهەر خانەیەکدا ڕەنووسەکان بەراوردبکە. پاشان ئەم بەراوردکردنە بۆ ڕیزکردنی ژمارەکان بەکاربهێنە.

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە کامیان گەورەترە ٧ملیار یان ٧ملیۆن؟

بەراوردبکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**٢** ١٨٠ ٢٢٥ ● ١٢ ٦٥١ **٣** ٣ ١٤٥ ٢٧٠ ● ٣ ١٥٤ ٨٣٠ **٤** ١٩٨ ٣٣٥ ● ١٩٨ ٣٣٥

ژمارەکان لە گەورەترین بۆ بچووکترین ڕیزبکە.

**٥** ١٧ ٣٧٩ ؛ ١٣ ٧٩٢ ؛ ١٣ ٩٧٨ **٦** ٩٨٠ ٤٧٢ ؛ ٩٨٠ ٥٢٦ ؛ ٩٨٠ ٤٣٥

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

بەراوردبکە. < یان > یان = لە شوێنی ● دابنێ.

**٧** ٥ ٦٥٠ ● ١٥ ٦٥٠ **٨** ٢٠ ٧٦٧ ٣٠٠ ● ٢ ٧٦٧ ٠٧١ **٩** ٥٠٩ ٧٨٢ ٦٥٠ ● ٥٠٩ ٥٦٢ ٧١٠

ژمارەکان لە گەورەترین بۆ بچووکترین ڕیزبکە.

**١٠** ٤٩ ٠٨٦ ؛ ٤٩ ٦٨٠ ؛ ٤٨ ٦٩٠ **١١** ٨٩٥ ٠٠٠ ؛ ٨ ٥٩٥ ٠٠٠ ؛ ٨٥٩ ٠٠٠

ژمارەکان لە بچووکترین بۆ گەورەترین ڕیزبکە.

**١٢** ١٧٨ ٢٨٦ ؛ ٧٧ ٥٩٠ ؛ ٧٨ ٩٣٥ **١٣** ٣٨ ٩٥٠ ٥٠٠ ؛ ٢٣٤ ٨٥٠ ١٠٠ ؛ ٢٣٤ ٦٥٠ ٢٠٠

ڕەنووسی نادیار کامەیە؟

**١٤** ١ ٩٨■ ٦٧٨ > ١ ٩٨٨ ٦٧٨ **١٥** ١٩■ ٧١٧ ٥٦٨ < ١٩٢ ٧١٧ ٥٦٨

تەواوبکە. گەورەترین ڕەنووس کە لەتوانادابێت بەکاربهێنە.

**١٦** ١■٥ ٤٣١ < ١٤٨ ٦٠٠ < ١٤■٥٩٩ **١٧** ٥ ٩٤١ ٦٠٠ > ٥ ٨■١ ٦٠٠ > ٥ ■٤١ ٦٠٠

**ڕێنوێنی** ماڵی داریا لەدووری ٤٥٥ م لە منارەی چۆلیەوە دوورە، ماڵی سارۆ بە ١١٠ م زیاتر لەماڵی داریا لە منارەی چۆلیەوە دوورترە. بەڵام ماڵی ئیبراهیم بە ١٥٠ م کەمتر لە ماڵی سارۆ دوورترە. ئەم زانیاریانە بۆ شیکاری پرسیاری ١٨، ١٩ بەکاربهێنە.

**١٨** ماڵی هەریەکەیان چەند لە منارەی چۆلی دوورە؟ **١٩** ماڵی کامیان لە منارەی چۆلی نزیکە؟ ماڵی کامیان لە دوورترین ماوەیە؟

**٢٠** **پرسیارەکە چیە؟** لە کۆمەڵەیەکی سێ ژمارەییدا. ژمارە ٣٤٥ ٧٩٨ بچووکترینیانە و ژمارە ٣٥٥ ٧٩٨ گەورەترینیانە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢١** ٩ × ٣ = ■ **٢٢** ٨ × ٤ = ■

ژمارەکە بە ١ ٠٠٠ گەورەتر بنووسە.

**٢٣** ٤ ٠٩٩ **٢٤** ٤٥ ٢٣٠

**٢٥** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — ئەو ژمارە کامەیە ملیۆنێك و حەڤدە هەزار و چوارسەد و شەست و پێنج دەنوێنی؟

أ ١ ١٧٠ ٤٦٥ ج ١ ٠١٧ ٤٦٥

ب ١ ٠١٧ ٦٤٥ د ١ ٠١٧ ٣٤٦

وانەی ٣

# بەشەکان لەهەزار و بەشەکان لە دەهەزار

# Thousandths and Ten - Thousandths



**پێداچوونەوەی خێرا**

ژمارە دەییەکە بنووسە

١ $\frac{٨}{١٠}$ ٢ $\frac{٢٤}{١٠٠}$ ٣ $\frac{٦٧}{١٠٠}$

٤ پێنج بەش لەسەد؟

٥ شەش و چوارده بەش لەسەد؟

**زاراوەکان**

بەشێك لەهەزار thousandth

بەشێك لە دەهەزار ten-thousandth

## فێربە

ئەگەر ١ دابەشی ١٠٠٠ ١ بکەیت و بەشێك ڕەنگ بکەیت. ئەوا **یەك بەش لەهەزار** بەدەست دەهێنی وە ئەگەر چوارگۆشە بەشێکت لەسەد گەورەکرد و دابەشتکرد بۆ ١٠ ئەستوونی یەکسان، پاشان یەك ئەستوونت ڕەنگکرد ئەوا بەشێك لەهەزار بەدەست دەهێنیت.




ئەگەر ١ دابەشی ١٠ ٠٠٠ بکەیت ئەوا **بەشێك لە دەهەزار** بەدەستدەهێنیت

١ ÷ ١٠ ٠٠٠ = $\frac{١}{١٠\ ٠٠٠}$ = ٠,٠ ٠٠١ = ١ بەش لە دەهەزار.

دەتوانی خشتەی خانەکان بۆ دیاریکردنی هەر ڕەنووسێك لە ژمارەی دەیی بەکاربهێنی. خشتەی خوارەوە ژمارە ٢,٧ ٨٣٥ دەنوێنێ.

| بەشەکان لە دەهەزار | بەشەکان لەهەزار | بەشەکان لەسەد | دەیەکەکان | , | یەکان |
|---|---|---|---|---|---|
| ٥ | ٣ | ٨ | ٧ | , | ٢ |
| ٠,٠٠٠١×٥ | ٠,٠٠١×٣ | ٠,٠١×٨ | ٠,١×٧ | , | ١×٢ |
| ٠,٠٠٠٥ | ٠,٠٠٣ | ٠,٠٨ | ٠,٧ | , | ٢,٠ |



▲ زانایان بەشەکان لە هەزار بۆ پێوانەی بڕی شلەکان بەکاردەهێنن. یەك مللیلتر بەشێك لە دەهەزاری لیترێك دەنوێنێ.

**نووسین بە ڕەنووس :** ٢,٧٨٣٥

**نووسین بە درێژی :** ٢ + ٠,٧ + ٠,٠٨ + ٠,٠٠٣ + ٠,٠٠٠٥

**نووسین بە پیتی :** دوو، حەوت دەیەك و هەشت بەش لەسەد و سێ بەش لەهەزار و پێنج بەش لە دەهەزار.

- چەند بەش لەهەزار لەبەشێك لەسەدا هەیە؟ لەدەیەك؟ لەیەك؟

**لەبیرت نەچێ** هەر خانەیەك لەلای ڕاستی فاریزەکە لە ژمارەی دەییدا. دەییەکی ئەو خانەیە دەنوێنێ کە ڕاستەوخۆ لە پێشەوەیەتی.

## ساغبکەوە

**١** ژمارەی بەشەکانی دەهەزار لەبەشێك لەهەزاردا چەندە؟ لەبەشێك لەسەد؟ لە دەیەك؟ لە یەك؟

**ژمارە دەییەکە بەدرێژی و بەپیتی و لەسەر شێوەی کەرت بنووسە.**

**٢** ١,٤٠٥ **٣** ٠,١٣٤ **٤** ١,٠٤٥ **٥** ٢,١٠٧ **٦** ٣,٠٠٠٣

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هەر ژمارەیەك بە درێژی و بە پیتی و لەسەر شێوەی کەرت بنووسە.**

**٧** ١,٠٦٧ **٨** ٠,١٢٣٤ **٩** ١٢,٠٦٥ **١٠** ٣,٢٠٦ **١١** ١,٥٨٢

**هەر ژمارەیەك بە ڕەنووس بنووسە.**

**١٢** هەشت بەش لەهەزار.

**١٣** پەنجاو چوار بەش لە دە هەزار.

**١٤** پێنج بەش لەسەد.

**١٥** یەك و شەست و دوو بەش لە دە هەزار.

**ژمارەکان بەدرێژی بنووسە.**

**١٦** ٢,٦ **١٧** ٠,٤٣ **١٨** ١,٠٢٦ **١٩** ٧,١٤٧٨

**هەریەك لەم ژمارە دەییانە بە پیت بنووسە.**

**٢٠** ٤,١٢ **٢١** ١١,٠٣ **٢٢** ٣,٢٤٦ **٢٣** ٠,٥٧٥٧

**ڕێنوێنی** لە ڕاهێنانی ٢٤ تا ٢٧ فاریزەکە لە شوێنێکی هەڵە دانراوە. ژمارە دەییە گونجاوەکە بنووسە.

**٢٤** خێرایی ئۆتۆمبیلێك لەسەر ڕێگای خێرا گەیشتە ٥,٠٥ کم/کاتژمێر.

**٢٥** سارا نەخۆش کەوت، پلەی گەرمی گەیشتە ٣,٩٥٠ پلە.

**٢٦** ڕێباز ٠,٢٥ م بازیدا.

**٢٧** هاوار ماسییەکی ڕاوکرد درێژییەکەی ٥,٢م بوو

**٢٨** بارستایی ئاوی ناو پەرداخێك ٨٢,٥ گرامە بارستایی ئاوەکە لە نیو پەرداخدا چەندە؟

**٢٩** **ڕێنوێنی** ژمارەیەکی دەیی دەکەوێتە ناوەڕاستی دوو ژمارەی ٠,٠٠٢ و ٠,٠٠٣ ئەو ژمارەیە کامەیە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٣٠** ٣,٥ لەسەر شێوەی ژمارەی کەرتدار بنووسە.

**٣١** ژمارەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.

١ ٢٠٥ ٨٦٩ ؛ ١ ٢٠٥ ٨٩٦ ؛ ١ ٢٥٠ ٨٦٩

**٣٢** ٣٠ × ٤٠ = ▢ **٣٣** ١٠ × ٢٠ = ▢

**٣٤** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — ژمارەی لاکانی چوارگۆشە.

أ ٣ لا ب ٤ لا ج ٦ لا د ٨ لا

وانەی ٤

# ڕیزکردنی ژمارە دەیییەکان

## Ordering Decimal numbers



### پێداچوونەوەی خێرا

بەراوردبکە. > یان < یان = لەشوێنی ⬤ دابنێ.

١ ٣٤ ⬤ ٤٣

٢ ٢٠٥ ⬤ ٢٥٠

٣ ٦٠٠ ⬤ ٦٠٠

٤ ٤٥٠٠ ⬤ ٤٥٠

٥ ٢٩ ٦٨٣ ⬤ ٢٦ ٩٨٣

### فێربە

**زیاتر یان کەمتر** لەیارییەکی جمناستیکدا، سامان ٨,٨٥ خاڵی بەدەستهێنا و سالار ٨,٦٩ خاڵ. کامیان زۆرتری بەدەستهێناوە؟ دەتوانی هێڵی ژمارەکان بۆ بەراوردکردنی ژمارە دەیییەکان بەکاربهێنیت.




دەتوانرێ دووبارە بەهای خانەیی بەکاربهێنرێ بۆ بەراوردکردنی ژمارە دەیییەکان.

### نموونە ١

٣,٤٥٢ و ٣,٤٥٦ بەراوردبکە و فاریزەکان لەژێر یەکتر دابنێ، بگەڕێ بەدوای یەکەم خانە کە دوو ڕەنووسی جیاوازی تێدایە.

| هەنگاوی ١ | هەنگاوی ٢ | هەنگاوی ٣ | هەنگاوی ٤ |
|---|---|---|---|
| لەچەپەوە دەست پێبکە و یەکان بەراوردبکە. | دەیەکیەکان بەراوردبکە. | بەشەکان لەسەد بەوورارد بکە. | بەشەکان لە هەزار بەراورد بکە. |
| ٣,٤٥٢ ↓ ٣,٤٥٦ یەکسانن | ٣,٤٥٢ ↓ ٣,٤٥٦ یەکسانن | ٣,٤٥٢ ↓ ٣,٤٥٦ یەکسانن | ٣,٤٥٢ ↓ ٣,٤٥٦ ٦ > ٢ یان ٢ < ٦ |

کەواتە ٣,٤٥٦ > ٣,٤٥٢ یان ٣,٤٥٢ < ٣,٤٥٦

### نموونە ٢

ژمارەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە: ٢,٤٨٥٣ ؛ ٢,٤٨٤٤ ؛ ٢,٤٨٦٢

| هەنگاوی ١ | هەنگاوی ٢ | هەنگاوی ٣ | هەنگاوی ٤ |
|---|---|---|---|
| لەچەپەوە دەست پێبکە و یەکان و دەیەکیەکان بەراوردبکە. | بەشەکان لەسەد بەراورد بکە. | بەشەکان لەهەزار بەراورد بکە. | ژمارەکان ڕیزبکە. |
| ٢,٤٨٥٣ ↓↓ ٢,٤٨٤٤ ↓↓ ٢,٤٨٦٢ یەکسانن | ٢,٤٨٥٣ ↓ ٢,٤٨٤٤ ↓ ٢,٤٨٦٢ یەکسانن | ٢,٤٨٥٣ ↓ ٢,٤٨٤٤ ↓ ٢,٤٨٦٢ ٤ < ٥ < ٦ | ٢,٤٨٤٤ < ٢,٤٨٥٣ < ٢,٤٨٦٢ |

- لە نموونەی ٢ چۆن ژمارەکان لەگەورەوە بۆ بچووک ڕیز دەکەیت؟

## ساغبکەوە

١ ڕوونبکەوە چۆن ڕیزکردنەکە دەگۆڕێت ئەگەر ژمارە ٢,٤ ٨٥٦ بۆ لیستی ژمارەکان لە نموونەی ٢ زیادبکرێت؟

< یان > یان = لەشوێنی ● دابنێ. هێڵی ژمارەکان بەکاربهێنە.




٢ ٦,١٥٢ ● ٦,١٢٥   ٣ ٦,١٤ ● ٦,١٤٠   ٤ ٦,١١٤ ● ٦,١١٨

٥ ٦,١٠٩ ● ٦,١٩٠   ٦ ٦,١٧٠ ● ٦,١٧٥   ٧ ٦,١٧٦ ● ٦,١٦٧

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

< یان > یان = لەشوێنی ● دابنێ

٨ ٠,٦٥ ● ٠,٦٣   ٩ ١,٤ ● ١,٤٠٠   ١٠ ٢٢٩,٠٣٥ ● ٢٢٩,٤٠٦

١١ ١٣٢,٩٤ ● ١٣٢,٤٨   ١٢ ١٥٦,٩٣٣ ● ١٥٦,٩٨   ١٣ ٩٩,٩٨٩ ● ٩٩,٩٩٨

١٤ ٠,٩٠٥ ● ٠,٩٠٥   ١٥ ٦٣,٩٣٨ ● ٦٣,٩٣٩   ١٦ ٤٧٦,٠٦٩ ● ٤٧٦,٠٩٦

لە بچووکترینەوە بۆ گەورەترین ڕیزبکە.

١٧ ٦,٥٨ ؛ ٦,٣٨ ؛ ٦,٢٩ ؛ ٧,٠٨   ١٨ ١٣,٣٩٣ ؛ ١٣,٣٠٩ ؛ ١٣,٣٣٩ ؛ ١٣,٠٣٩

١٩ ٤,١٠٢ ؛ ٤,١٠٥ ؛ ٤,١١٨ ؛ ٤,١١٠   ٢٠ ١٥,٢٥٩ ؛ ١٥,٣٨٩ ؛ ١٥,٢٩١ ؛ ١٥,٣٠١

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٢١ تا ٢٣ بەکاربهێنە.

| مەمکدارە کلك درێژەکان | |
|---|---|
| مەمکدارەکان | درێژی کلك بەمەتر |
| فیلی ئەفریقی | ١,٢٩ |
| زەرافە | ١,٠٩٩ |
| فیلی ئاسیایی | ١,٤٨٩ |
| گای ئەفریقی | ١,١٠٩ |
| پڵنگ (بەور) | ١,٤٠ |



٢١ درێژییەکان لە کورترینەوە بۆ درێژترین ڕیزبکە.

٢٢ کام دوو گیانەوەر کلکی هەریەکێکیان لە کلکی فیلی ئەفریقی درێژترە؟

٢٣ **مانای ژمارە** کام لەم گیانەوەرانە درێژی کلکی لە ١,٣٠م درێژترە و لە ١,٤٥م کورترە؟

٢٤ **بنووسە** چۆن دوو ژمارەی ١,٢٣ و ١,٢٧ بەراورد دەکەیت. ڕوونبکەوە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

٢٥ ڕاستە یان هەڵەیە؟ ١,١١١ > ١١

٢٦ ژمارە ٣,٠٢٥ بە پیتی بنووسە.

٢٧ ٢,٩٨ − ١,٨٠   ٢٨ ١,١٥ + ٤,٢٥

٢٩ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) کام ژمارە دەیی هاوتا نیە بە ژمارە پێنج دەیەکی و بەشێك لە سەد؟

أ ٠,٥٠١   ج ٠,٥١٠

ب ٠,٥١٠٠   د ٠,٥١

وانەی
٥

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان
## دۆزینەوەی ئەنجامەکان

## Problen Solving Skills
### Finding Results



**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٤ × ٧
2. ٦ ÷ ١٨
3. ٥ ÷ ٢٥
4. ١٢ ÷ ١٢٠
5. ١٠ ÷ ٢٤,٠٨

تێبگە ‹ پلاندابنێ ‹ شیکاربکە ‹ ساغبکەوە

**بیربکەوە** هەندێ جار وا پێویستە پێدراوەکان شیبکەیتەوە بۆئەوەی ئەنجام بەدەستبێنی.

خشتەکە و ئەستوونی ڕوونکردنەوەییەکە ڕاستی تاقیکردنەوە لەسەر پێنج ڕووەک لەهەمان جۆر دەخاتە ڕوو.

دەتوانی پێدراوەکان بۆ دۆزینەوەی ئەنجامەکان بەکاربهێنی.






**دڵۆپە خۆراکیەکان**

| نەمام | ژمارەی دڵۆپەکان |
|---|---|
| أ | ١ |
| ب | ٥ |
| ج | ٩ |
| د | ١٣ |
| هـ | ١٧ |

| شیکردنەوە | دەرئەنجام |
|---|---|
| • سەرنج لە ئەستوونە ڕوونکردنەوەییەکە بدە کام ڕووەک گەشەی زۆرترە؟ | ڕووەکی (ج) زۆرترین گەشەی کردووە. |
| • سەرنج لە خشتەکە بدە درێژترین ڕووەک چەند دڵۆپەی وەرگرتووە؟ | ڕووەکی (ج) ٩ دڵۆپەی وەرگرتووە. |
| • تێبینی چ پەیوەندییەک لەنێوان ژمارەی دڵۆپەکان و گەشەی ڕووەکەکان دەکەیت؟ | ئەگەر ژمارەی دڵۆپەکان لە ٩ زیاتر نەبێت، ئەوا گەشەی ڕووەکەکان زیاد دەکات. وە ئەگەر ژمارەکە لە ٩ زیاتربێت ئەوا گەشەی ڕووەکەکان کەمدەکات. |

- پوختەی ئەنجام لەبارەی ڕووەکەکانی (أ) و (ب) و (ج) کامەیە؟ لەبارەی دوو ڕووەکی (د) و (هـ)؟
- ئەگەر تێکڕای گەشەی ڕووەکی (د) ٥٣,٨٩سم وە ڕووەکی (هـ) ٨٣سم بێت لەبارەی پێنج ڕووەکەکە چیت بەدەست دەکەوێت؟

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ئایا دەتوانی لە پرسیارەکانی ١ تا ٤ پوختەی ئەنجامی دیاریکراو لە پێدراوەکان بەدەستبهێنی؟ بەڵێ یان نەخێر بنووسە. پاشان کارەکەت ڕوونبکەرەوە.**

**لە پۆلەکەی مامۆستا کامەران ٢٥ قوتابی هەیە، درێژییەکانیان لەنێوان ٨٣ و ١٠٠سم دایە.**

١ هەموو قوتابیان درێژییان لە ٩٠سم زیاترە.

٢ درێژترین قوتابی لە پۆلی مامۆستا کامەران درێژییەکەی لە ٩٦سم زیاترە.

٣ هەموو قوتابیان لەمامۆستا کامەران کورتترن.

٤ جیاوازی نێوان درێژترین و کورتترین قوتابی ١٧سمە.

**زارا ویستی شیرینی لەجۆری پارچەی بچووك بکڕێت. وای بۆدەچێت کە قووتووی شیرینییە گەورەکە خواستەکەی دێنێتەدی. قووتووە گەورەکە ١٠ پارچەی تێدایە. بەڵام بچووکەکە ٨ پارچەی تێدایە، بارستایی قووتووە بچووکەکە ٣,٢٠کگم و بارستایی قووتووە گەورەکە ٣,٩٠کگم.**

٥ کام بڕ بارستایی پارچەکە لە قووتووە بچووکەکە نیشاندەدات.

أ ٣٢٠ × ٨

ب ٣٢٠ × ٢٠

ج ٣٢٠ ÷ ٨

د ٣٢٠ × ١٠

٦ کام ئەنجام پوختەی پێدراوەکانە.

أ بارستایی پارچەکە لەقووتووە بچووکەکە کەمترە

ب بارستایی پارچەکە لە قووتووە گەورەکە کەمترە

ج بارستایی پارچەکە لەهەردوو قووتووەکە وەکیەکن

د بارستایی پارچەکە لە قووتووە بچووکەکە دوو ئەوەندەی بارستاییەکەیەتی لە قووتووە گەورەکە.

## جێبەجێکردنە جیاوازەکان

### بەکارهێنانی پێدراوەکان



**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ٧ تا ١١ بەکاربهێنە.**

| گیانەوەرەکان | فیل | ورچ | زەرافە |
|---|---|---|---|
| بارستایی | ٤٤٥٠ کگم | ٧٢٥کگم | ١٨٠کگم |
| خێرایی | ٥١ کم/ك | ٤٨ کم/ك | ٥١ کم/ك |
| کاتی خەوتن لەڕۆژێکدا | ١٨٠خ | ٨ك | ٢٤٠ خ |
| بڕی میوە و تەڕەی بەکارهاتوو لەڕۆژێکدا | ١٨٠٠ گم | ٠,٩ کگم | ١٠٠ گ |

١ کیلۆگرام (کگم) = ١٠٠٠ گرام (گ)

١ کاتژمێر (ك) = ٦٠ خولەك (خ)

٧ ئایا بارستایی گیانەوەرەکە خێراییەکەی دیاردەکات؟ ئەمە ڕوونبکەوە.

٨ **هەڵە لەکوێیە؟** بارام دەڵێ گیانەوەر تا بڕی خۆراکی زۆربێت ماوەی خەوتنی زۆرترە. هەڵە لەووتەی بارام دیاربکە.

٩ کام گیانەوەر زۆرترین بڕ لەسەوزە و میوە دەخوات؟ ڕۆژانە چەند کیلۆگرام دەخوات؟

١٠ ورچ چەند کاتژمێر زیاتر لە فیل دەخەوێت هەروەها لە زەرافە؟

١١ **پرسیارەکە چییە؟** پێدراوەکانی خشتەکە بەکاربهێنە. وەڵام بریتییە لە دووئەوەندەی هێندەکە.

بەشی ١

# پێداچوونەوە
# Review

| |
|---|
| ملیۆن million |
| ملیار billion |
| هەزار thousand |
| دەیەك tenth |
| بەشێك لەسەد hundredth |
| بەشێك لەهەزار thousandth |
| بەشێك لەدەهەزار ten- thousandth |

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

**دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.**

١ هەزار هەزار بریتییە لە ___؟___ .

٢ هەزار ملیۆن بریتییە لە ___؟___ .

٣ ئەو ژمارە دەییەی کەبەشێك لە ١٠ بەشی یەکسان لەیەك دەنوێنێ بریتییەلە ___؟___ .

٤ ئەگەر ١ دابەشی هەزار بکەیت ئەوا ___؟___ بە دەست دێنی.

٥ ژمارەی دەیی یان کەرت کەبەشێك لە ١٠٠ بەشی یەکسان لەیەك دەنوێنێ بریتییە لە ___؟___ .

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

**ژمارە دەییەکە بەڕەنووس بنووسە.**

٦ بیست و یەك و بیست و یەك بەش لە سەد.

٧ حەوت و ٦ دەیەك.

٨ سێ سەد ، و چل و نۆ بەش لەهەزار.

**بەهای ڕەنووسی شین لەهەر ژمارەیەك بنووسە.**

٩ ١٦٢ ٤٠٨

١٠ ٨٧ ٩١٤

١١ ٥ ٣٢٣ ٠٢٢

١٢ ٢٧ ١٤٠ ٦٥٢

**> یان < یان = لەشوێنی ● دابنێ.**

١٣ ١٠٤ ٦٩٠ ● ١٤٠ ٦٩٠

١٤ ٣ ٢٥٠ ● ١٣ ٢٥٠

١٥ ٩ ٧٨٢ ٦٥٠ ● ٩ ٧٨٢ ٦٥٠

**هاوتان یان هاوتانین بۆ هەریەك لە جووتە ژمارە دەییەکان بنووسە.**

١٦ ٠,٦٥٠ و ٠,٦٥

١٧ ٩,٥٠٢ و ٩,٥٢

١٨ ٣,٠٠٤٠ و ٣,٠٤٠

١٩ ١٠,٠١ و ١٠,٠١٠

**ژمارەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.**

٢٠ ١٤ ٣٢٦ ؛ ١٤ ٦٢٣ ؛ ١٣ ٤٢٦

٢١ ٥,٩٨ ؛ ٥,٩٠٨ ؛ ٥,٨٠٩

٢٢ ١ ٥٠٧ ٣٦٩ ؛ ١ ٥٠١ ٣٦٩ ؛ ١ ٥٠٢ ٣٦٩

٢٣ ٦,٩٦٩ ؛ ٩,٦٩٦ ؛ ٦,٦٩٦

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

٢٤ لەوەرزی ترێ ڕنیندا زریا ٤٣,٧٥ کگمی لە ٧ کاتژمێردا ڕنی. بەڵام دانا ٥٦,٢٥ کیلۆگرامی لە ٩ کاتژمێردا ڕنی، پوختەی ئەنجام لەم پێدراوانە چییە؟

٢٥ زاناکان خەون بەدروستکردنی کەشتیەکی ئاسمانیە وە دەبینین لەدوا ڕۆژدا کە بەخێرایی ١٠٠ ٠٠٠ کم لە چرکەیەکدا بڕوات. ئەم کەشتیە بەچەند چرکە ملیۆنێك کیلۆمەتر؟ ١٠ ملیۆن کم؟ ملیار کم دەبڕێت؟

## بەشی ١

# ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە
## Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! CAUTION!**

**بەدوای ووشە گرنگەكاندا بگەڕێ**

ووشە گرنگەكە لە پرسیاری ٤ ئەوەنیە.

ئەمەش پێویستە كە بەها جیاوازەكە بۆ یەك ملیار بدۆزیتەوە.

**وەڵامی ڕاست بۆ پرسیارەكانی ١ تا ٨ هەڵبژێرە.**

**١** نووسین بە ڕەنووس بۆ ژمارە
٢ + ٢٠٠ + ٢٠ ٠٠٠ + ٢ ٠٠٠ ٠٠٠، بریتییەلە

أ ٢ ٠٢٠ ٢٠٢ ج ٢ ٢٢٠ ٢٢٠
ب ٢ ٢٢٢ د ٢٢٠ ٢٠٢

**٢** نووسین بەپیتی بۆ ژمارە ٨,٠ ٠١٩ بریتییە لە

أ هەشت و نۆزدە ج هەشت و نۆزدە بەش لەهەزارا
ب هەشت و نۆزدە دەیەك د هەشت و نۆزدە بەش لەدەهەزارا

**٣** شێوەی كەرتی بۆ ژمارە ٠,٩ بریتییە لە

أ $\frac{١}{٩}$ ب $\frac{٩}{١٠}$ ج $\frac{٩}{١٠٠}$ د $\frac{٩}{١٠٠٠}$

**٤** كام لەم ژمارانە هاوتای ملیار نییە؟

أ ١٠٠ دەملیۆن ج ١ ٠٠٠ ٠٠٠ هەزار
ب ١ ٠٠٠ ملیۆن د ١٠ ٠٠٠ دەهەزار

**٥** كام لەم هێمایانە وادەكات ڕستەكە ڕاست بێت؟

١ ٠٦٤ ٦١٥ ● ١ ٠٤١ ٥٧٨

أ = ب > ج < د +

**خشتەكە بۆ شیكاری پرسیاری ٦، ٧ بەكاربهێنە.**

| ئەو زمانانەی كە لەویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پێی دەدوێن | |
|---|---|
| زمان | ژمارەی كەسان |
| فەرەنسی | ١ ٧٠٢ ٠٠٠ |
| عەرەبی | ٢ ٦٤٠ ٠٠٠ |
| چینی | ١ ٢٤٩ ٠٠٠ |
| ئیسپانی | ١٧ ٣٣٩ ٠٠٠ |

**٦** كام لەم زمانانە زۆرترین كەس پێی دەدوێن

أ فرەنسی ج چینی
ب عەرەبی د ئیسپانی

**٧** كام لیست زمانەكان لە بچووكەوە بۆ گەورە ڕیز دەكات بەپێی ژمارەی قسەكاران.

أ ئیسپانی، فەرەنسی، چینی، عەرەبی
ب عەرەبی، چینی، ئیسپانی، فرەنسی
ج چینی، فرەنسی، عەرەبی، ئیسپانی
د فرەنسی، عەرەبی، ئیسپانی، چینی

**٨** بەهای ڕەنووسی ٩ لە ژمارە ٣,٥٩٦ چەندە؟

أ ٠,٠٠٩ ب ٠,٠٩ ج ٠,٩ د ٩٠٠

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know

**٩** بۆچی ٣,٠٢ لەگەڵ ٣,٠٢٠ هاوتایە و بەڵام هاوتانیە لەگەڵ ٣,٠٠٢؟

**١٠** چۆن دەزانی كە ٣٥٠ ٠٠٠ یەكسان نییە بە ٣٠٥ ٠٠٠؟

**١١** دوو ژمارەی دەیی كەمترە لە ١، وە هەریەكیان چوار ڕەنووس لەلای ڕاستی فاریزەكە لەخۆدەكرن. لە هەریەكیاندا ڕەنووسی ٩ دەكەوێتە خانەی دەیەك و ڕەنووسی ٧ دەكەوێتە خانەی بەشەكان لە هەزار، ڕوونبیكەوە چۆن «بەراورد» لەنێوان ئەو دوو ژمارەیەدا دەكەیت؟

بەشی ٢

# کۆکردنەوە و لێدەرکردن

## Adding and Subtracting

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژمارەی ئەو گیانەوەرانەی کە مەترسی لەناو چوونیان لەسەرە زیاددەکات لە وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیاتر لە ١ ٠٠٠ جۆر گیانەوەر هەیە کە مەترسیان لەسەرە بۆ لەناوچوون.

**پرسیارێك بۆ شیكار**

ژمارەی جۆری مەمکدارەکان کە مەترسی لەناوچوونیان لەسەرە چەندی زیاترە لە ژمارەی جۆری ماسییەکان و مێرووەکان و خشۆکەکان کە مەترسی لەناوچوونیان لەسەرە.

جۆرەکانی کەمەترسی لەناوچونیان لەسەرە

| پۆل | ژمارەی جۆرەکان |
|---|---|
| باڵندەکان | ٢٧٤ |
| ماسییەکان | ١١٩ |
| مێرووەکان | ٤١ |
| مەمکدارەکان | ٣٣١ |
| خشۆکەکان | ١١٤ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

| |
|---|
| سەرجەم sum |
| جیاوازی difference |
| ئەنجامی لێکدان product |
| ڕەنووس digit |
| بەش لەسەد hundredth |
| بەش لەهەزار thousandth |
| دەیەك tenth |

## زاراوەکان

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ___؟___ بریتییە لە ئەنجامی کرداری لێدەرکردن.

٢ ئەگەر یەك دابەشی ١٠ بکەیت ئەوا $\frac{١}{١٠}$ یان ___؟___ دەستدەکەوێت.

٣ ئەگەر یەك دابەشی ١٠٠ بکەیت ئەوا $\frac{١}{١٠٠}$ یان یەك ___؟___ دەستدەکەوێت.

٤ ئەگەر یەك دابەشی ١٠٠٠ بکەیت ئەوا $\frac{١}{١٠٠٠}$ یان یەك ___؟___ دەستدەکەوێت.

٥ ___؟___ بریتییە لە ئەنجامی کۆکردنەوە.

## نزیککردنەوە

هەر ژمارەیەك بۆ نزیکترین دە نزیکبکەوە.

٦ ٦٢٥    ٧ ٧٠٤    ٨ ٤ ٧١٢    ٩ ٤٢٧

هەر ژمارەیەك بۆ نزیکترین سەد نزیکبکەوە.

١٠ ٧٠    ١١ ٦ ٣٥٠    ١٢ ٢ ٠٨٩    ١٣ ١ ٤٦٥

## ئەژمێر کردنی هزری: بەدوای ڕێسادا بگەڕێ.

ڕێساکە بنووسە. ئەژمێرکردنی هزری بەکاربهێنە.

١٤

| ناوەوە | دەرەوە |
|---|---|
| ٧ | ١٠ |
| ١٧ | ٢٠ |
| ٢٧ | ٣٠ |
| ٣٧ | ٤٠ |

١٥

| ناوەوە | دەرەوە |
|---|---|
| ١٢ | ٢٠ |
| ٢٢ | ٣٠ |
| ٣٢ | ٤٠ |
| ٤٢ | ٥٠ |

١٦

| ناوەوە | دەرەوە |
|---|---|
| ٦٥ | ٥٥ |
| ٥٥ | ٤٥ |
| ٤٥ | ٣٥ |
| ٣٥ | ٢٥ |

١٧

| ناوەوە | دەرەوە |
|---|---|
| ١٠٠ | ٦٥ |
| ١٥٠ | ١١٥ |
| ٢٠٠ | ١٦٥ |
| ٢٥٠ | ٢١٥ |

## سفر لە کۆکردنەوە و لێدەرکردندا.

کۆبکەوە یان لێدەربکە. لەکاتی پێویستدا خرکردنەوە و خوردکردنەوە «هەڵوەشانەوە» بەکاربهێنە.

١٨ ٣٠ − ٢٥

١٩ ٧٠ − ٣٦

٢٠ ٢٠٠ − ١٥٦

٢١ ٧٠٠ − ٢٩٣

٢٢ ٤٠٠ + ٣٥٠

٢٣ ٤,١ − ٢,٧

٢٤ ٦,٥ + ٧,٨

٢٥ ٣٠,٠ − ١٩,٦

٢٦ ٨,٣ + ١١,٩

٢٧ ١٠,٠ − ٩,٨

٢٨ ٢,٤ + ٧,٩

٢٩ ١٣,١ − ٢,٢

وانەی ١

# خەملاندنی سەرجەم و جیاوازی

## Estimate Sum and Difference



**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای ڕەنووسی ٥ لەهەر ژمارەیەکدا چەندە؟

١ ٣ ٥٨٢ ٠١٧

٢ ٩ ٠٢٣ ٤٥٦

٣ ٥ ٠٣٤ ٧٦٨

٤ ٢ ٠٥٧ ٣١٦

٥ ١٧ ٠٦٣ ٥٢١



### فێربـــــــە

لە ڕاپرسیەکدا لەبارەی یارییەکانی جامی عێراقی بۆ تۆپی پێ دەرکەوت نزیکەی ٧١٥ ٠٤٠ کور و ١٦٣ ٦٠٣ کچ لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە یارییەکانیان بینی. نزیکەی چەند کەس یارییەکانیان بینیوە؟

**نموونە ١** سەرجەم بەنزیککردنەوە بخەملێنە.

| | | |
|---|---|---|
| ٧١٥ ٠٤٠ ⟵ | ٧٠٠ ٠٠٠ | بۆ نزیکترین سەد |
| ١٦٣ ٦٠٣ + ⟵ | ٢٠٠ ٠٠٠ + | هەزار نزیکبکەوە |
| | ٩٠٠ ٠٠٠ | |

نزیکەی ٩٠٠ ٠٠٠ کەس یارییەکانیان بینی

**نموونە ٢** نزیکەی١٦٣ ٦٠٣ کچی عێراقی بە گشتی یارییەکانیان بینی لەنێوانیاندا ٨ ٥٩٥ کچیان لە هەرێمی کوردستاندا بوو نزیکەی چەند کچ لە ناوچەکانی تری عێراق یارییەکانیان بینیوە؟

جیاوازی نێوان کچانی عێراقی و هەرێم کە یارییەکانیان بینیوە بەنزیککراوەیی چەندە؟

| | | |
|---|---|---|
| ١٦٣ ٦٠٣ ⟵ | ١٦٤ ٠٠٠ | بۆ نزیکترین |
| ٨ ٥٩٥ − ⟵ | ٩ ٠٠٠ − | هەزار نزیکبکەوە |
| | ١٥٥ ٠٠٠ | |

نزیکەی ١٥٥ ٠٠٠ کچ لەبەشەکانی تری عێراق یارییەکانیان دیوە؟

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی سەرجەم یان جیاوازی بە نزیککردنەوەی ژمارەکان بخەملێنی. پێش جێبەجێکردنی کردارە ژمێرەییەکان.

هەروەها دەتوانی لێکدان بەکاربهێنی بۆ خەملاندنی سەرجەم.

**نموونە ٣** وا دابنێ کە کچەکان لەسێ ناوچەی جیاوازی عێراقدا یاری کۆتاییان دی ٣ ٨٨٩ لەناوچەی باشور و ٣ ٥٠٤ لە هەرێمی کوردستان و ٤ ٢٣٤ لە ناوچەکانی تر. بەنزیککراوەیی چەند کچ یاری کۆتاییان بینیوە؟

لەبەرئەوەی هەرژمارەیەك نزیکە لە ٤ ٠٠٠ بۆیە دەتوانی کرداری لێکدان بەکاربهێنی.
٤ ٠٠٠×٣ = ١٢ ٠٠٠

کەواتە، نزیکەی١٢ ٠٠٠ کچ یاری کۆتاییان بینیوە.

## ساغبکەوە

**١** **ڕوونیبکەوە** چۆن ئەژمێرکردنی هزری بۆ خەملاندنی سەرجەم و جیاوازی بەکاردەهێنیت.

**بەنزیککردنەوە بخەملێنە.**

**٢** ٤٣٥ ٤٧٦
٢٤١ ١٣١ −

**٣** ٨٤٥ ٠٠٨
١٢٤ ٨٩٥ +

**٤** ٧٥٢ ٤٠١
٤٩١ ٩٢٢ −

**٥** ٤ ٨٠١ ٤٢١
١ ٦٣٢ ٩٧٠ −

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بەنزیککردنەوە بخەملێنە.**

**٦** ٤٨٢ ٦٣١
٢٢٢ ٩٦٥ −

**٧** ٥٠٢ ٩٦٣
١٣٢ ٦٣١ −

**٨** ٤٩٣ ٥٨٢
١٨٢ ٧٨٥ +

**٩** ٥ ٤٨٢ ١١٠
١ ٢١٦ ٨٥٠ −

**١٠** ١٨٧ ٥٩٠ + ٣٩٧ ٣٥٢

**١١** ٤٩٥ ٠٠٨ − ٥١٢ ٨٢٤

**١٢** ٣٢١ ٩٤٥ + ٨٩ ٤٠٥

**بخەملێنە پاشان بەراوردبکە.< یان > لەشوێنی ● دابنێ.**

**١٣** ٤٥ ٩٢٤ + ٦٨ ٢٥٨ ● ٢٤ ٣٩١ + ٦٩ ٢١٠

**١٤** ٢٥ ٩٢٤ − ٩١ ٣٠٨ ● ٢٤ ٣٩١ + ٧٤ ٣٦١

**١٥** ١٣ ٧٢٥ − ٨٦ ٥٥١ ● ١٤ ٦٣٨ − ٨٢ ٣٥٦

**١٦** ٢٩ ٥٦٣ + ٨٦ ٩٣١ ● ٨٩ ٢٠٤ + ٢٣ ٦٨٩

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** **خشتەکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ١٧ تا ١٩ بەکاربهێنە.**

ئامادەبووانی یارییەکانی جامی لوبنان بۆ باسکە

| سالّ | کەس |
| --- | --- |
| ١٩٩٢ | ٣٧ ٧٤٠ |
| ١٩٩٣ | ١٢٨ ٢٣٨ |
| ١٩٩٤ | ٣٠ ١١٥ |
| ١٩٩٥ | ١٢ ١٤٦ |
| ١٩٩٦ | ٢ ٠٢٠ |

**١٧** سەرجەمی ئامادەبووان لەهەموو ساڵەکاندا بەنزیککراوەیی چەند کەس بوون؟

**١٨** ژمارەی ئامادەبووانی ساڵی ١٩٩٣ چەندی زیاترە لە ساڵی ١٩٩٢؟

**١٩** وادابنێ ژمارەی بەشداربووان لە ساڵی ١٩٩٣دا، ١٦ ٢٠٩ کەسیان لەڕەگەزی عەرەبی دەرەوەی لوبنان و ٨ ٠٤٧ کەسیان لەڕەگەزی بێگانەبوون. چەند کەسی لوبنانی ئامادەی یارییەکەبوون؟

**٢٠** **؟ پرسیارەکە چییە؟** هەستی و سێ لە هاوڕێکانی لە ڕیزێك لەبەرامبەر کۆگای یارییە ئەلیکترۆنیەکان وەستابوون. هەستی ڕاستەوخۆ لەدوای دڵشاد و لەپێش دڵزارەوە بوو. دڵدار لەکۆتایی بوو. وەڵام دڵشاد.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢١** ٤ ٩٥٤ + ٢ ٦٠٨ =

**٢٢** کام لەم دوو ژمارەیە، ٥٢,٧ یان ٥٢,٧٠٠، هاوتایە بۆ ژمارەی دەیی ٥٢,٧٠؟

**٢٣** بەراورد لە نێوان ٧٠٦٤ و ٧٦٤٤ بکە بە بەکار هێنانی یەکێك لەهێماکانی < یان > یان= •

**٢٤** ١ ٤٣٥ ٩٨٧ بۆ سەدهەزار نزیکبکەرەوە.

**٢٥** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — نزیککردنەوەی ژمارە ٥ ٥٦٧ ٣٩٨ بۆ نزیکترین سەدهەزار کامەیە؟

أ ٥ ٠٠٠ ٠٠٠
ب ٥ ٦٠٠ ٠٠٠
ج ٦ ٠٠٠ ٠٠٠
د ٦ ٥٠٠ ٠٠٠



## پێداچوونەوەی خێرا

| ٢ | ١ |
|---|---|
| ٥ ٧٠٠ − ٢ ٢٠٠ | ٤٥٠ + ٥٥٠ |

| ٤ | ٣ |
|---|---|
| ٤ ٠٠٠ + ٨ ٠٠٠ + ٦ ٠٠٠ | ٤ ٢٠٠ + ٦٠٠ |

وانەی ٢

# کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارەکان

# Adding and Subtracting Numbers

### فێربە

### یارمەتی گیانداران بدە

هەندێك زانای خۆبەخش یارمەتی دووبارە گێڕانەوەی گیانەوەری (لاق ڕەش) دەدەن تا لەژینگە سروشتییەکەی خۆیدا بژی. خۆبەخشەکان ٢ ٣٨٥ کاتژمێر کاریان لەماوەی ئەم ساڵدا تۆمارکرد وە ١ ٠٩٨ کاتژمێر لەماوەی ساڵی ڕابردوودا. خۆبەخشەکان چەند کاتژمێریان لەماوەی ئەم دوو ساڵەدا تۆمارکردووە؟

▲ لاق ڕەش (لەگوڕ هەڵکەنە دەچێت)

#### نموونە ١

کۆبکەوە ٢ ٣٨٥ + ١ ٠٩٨

بخەملێنە ٢ ٠٠٠ + ١ ٠٠٠ = ٣ ٠٠٠

$$\begin{array}{r} ^{١١}\\ ٢\,٣٨٥ \\ +\ ١\,٠٩٨ \\ \hline ٣\,٤٨٣ \end{array}$$

لەیەکانەوە دەستپێبکە ولە کاتی پێویستدا کۆبکەوە

ئەگەر ژمارەی کاتژمێرەکان کە خۆبەخشەکان تۆماریان کردووە ٣ ٤٨٣ کاتژمێر بێت لەبەرئەوەی ٣ ٤٨٣ نزیکە لەژمارەی نزیککراوی ٣ ٠٠٠. کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

#### نموونە ٢

ژمارەی کاتژمێرە تۆمارکراوەکانی ئەمساڵ چەندی زیاترە لە ژمارەی کاتژمێرەکانی ساڵی پار؟

لێدەربکە ٢ ٣٨٥ − ١ ٠٩٨

بخەملێنە ٢ ٠٠٠ − ١ ٠٠٠ = ١ ٠٠٠

$$\begin{array}{r} ٢\,\not{٣}\,\not{٨}\,\not{٥} \\ -\ ١\,٠٩٨ \\ \hline ١\,٢٨٧ \end{array}$$

(ژمارە بچووکەکانی سەرەوە: ١٧، ٢، ٧، ١٥)

لەیەکانەوە دەستپێبکە لە کاتی پێویستدا خوردبکەوە

کەواتە خۆبەخشەکان ١ ٢٨٧ کاتژمێریان لەماوەی ئەمساڵدا زیاتر لەساڵی ڕابردوو تۆمارکردووە. لەبەرئەوەی ١ ٢٨٧ نزیکە لە ژمارەی نزیککراوی ١ ٠٠٠ کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

- بەهای خانەیی لەهەردوو کرداری کۆکردنەوە و لێدەرکردن چۆن بەکاردەهێنیت؟

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن بەهای خانەیی دەناسی کەپێویستە یەکەمجار خرکردنەوەی تێدا ئەنجام بدرێت لەکرداری کۆکردنەوە.

**سەرجەم یان جیاوازی ئەژمێربکە. بخەملێنە بۆ ساغکردنەوە.**

**٢** ٦ ٣١٧ + ٨ ٩٠٣

**٣** ١٢ ٩١١ − ١٠ ٢٦٠

**٤** ١١ ٠٠٤ + ٨ ٩٨٦

**٥** ٦٧ ٤١١ − ٢٩ ٨٩٧

**٦** ٩٨ ٦٢٣ − ٧١ ١٢٨

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**سەرجەم یان جیاوازی ئەژمێربکە. بخەملێنە بۆ ساغکردنەوە.**

**٧** ٥ ٧٥٢ − ١ ٨٤٢

**٨** ٨ ٨٧٥ + ٤ ٩٠٨

**٩** ٢٧ ٠٣٢ − ١٩ ٩٨٦

**١٠** ١٧ ٦٢٠ − ٩ ٠٠٣

**١١** ٣٠ ٦٠٥ + ١٨ ٧٤٦

**١٢** ٦٨١ + ١٢٥ + ٢٣٤

**١٣** ٤٩٨ − ٦ ٠١٠

**١٤** ٧ ٨٩٤ + ٢ ٩٤٣

**١٥** ٤١٢ + ٧٨٦ + ١ ٢٩٨

**١٦** ٢٨ ٧٧٨ + ١١ ٨٣٢

**١٧** ١٢ ٠٤٠ − ٦١ ٩٣٣

**١٨** ٧ ٠٤٩ + ٨١٦ + ٢٠٨

**١٩** ٨ ٥٤٢ − ١٧ ٠٠١

**٢٠** ١٤ ٨٩٧ − ٢٠ ١٢٣

**بەکارهێنانی پێدراوەکانی خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٢١، ٢٢ بەکاربهێنە.**

| سێ پۆل لە گیانەوەراکان | | | |
|---|---|---|---|
| پۆل | ژ. جۆرەکان | مەترسیدار بۆ لەناوچون | لەناوچو |
| باڵندە | ٩ ٦٠٠ | ١ ١٠٠ | ٧٥ |
| خشۆك | ٤ ٧٠٠ | ٢١٠ | ٢٠ |
| مەمکدار | ٤ ٣٠٠ | ٦٥٠ | ٦٠ |

**٢١** چەند جۆر لەباڵندە لەناونەچوون و مەترسی لەناوچونیان نییە؟
چەند جۆر لەخشۆکەکان لەناونەچون و مەترسی لەناوچونیان نییە؟

**٢٢** سەرجەمی گیانەوەرانی لەناوچو وە مەترسیدارە بۆ لەناوچون چەندە؟

**٢٣** **پرسیارێك بنووسە** پێدراوەکانی خشتەکە بەکاربێنە.

**٢٤** لە پێشبڕکێی ڕاکردندا ئازاد دوای ڕزگار گەیشتە خاڵی کۆتایی بەڵام ڕەنێو پێش ڕزگار و دوای ئاران گەیشت. یەکەمین کەس کە گەیشتە خاڵی کۆتایی کێ بوو؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٥** ٥ ٥٦٧ ٣٩٨ بۆ نزیکترین ملیۆن نزیکبکەرەوە

**ژمارەیەکی دەیی هاوتا بۆهەر ژمارەیەك بنووسە**

**٢٦** ٧,٥

**٢٧** ٤,٠٦

**٢٨** لەبچووکترینەوە بۆ گەورەترین ڕیزبکە
٢ ٤٣٠ ٧١٧؛ ٢ ٤٧٠ ٧١٧؛ ٢ ٣٤٠ ٧١٧.

**٢٩** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
کام ژمارە بەهای خانەیی ڕەنووسی ٩ تێدا گەورەترە.

أ ١,٩٥٣

ب ٢,١٩٣

ج ٢,٣٥٩

د ٩,١٥٣

وانەی ٣

# نزیککردنەوەی ژمارە دەییەکان

## Rounding Decimals



**پێداچوونەوەی خێرا**

هەر ژمارەیەك بۆ بەهای ڕەنووسە شینەکە نزیکبکەوە.

١ ٥٧٢　٢ ١ ١٩٤

٣ ٢٥ ٣٥٧　٤ ١٧٥ ٥٠٦

٥ ٤١٥ ٧٢٣

**لە بیرتبێ**

ڕێسای نزیککرنەوە

- ئەو خانە دیاریکە کەبۆی نزیکدەکەیەوە
- سەیری ڕەنوسی لای ڕاستی خانەکە بکە
- ئەگەر ئەو ڕەنووسە بچووکتربوو لە ٥ ڕەنووسەکە لەخانەی نزیککرنەوە ناگۆڕێت
- ئەگەر ئەو ڕەنووسە ٥ یان گەورەتربوو ئەوا ئەو ڕەنووسەی کە لەخانەی نزیککرنەوەییە ١ زیاد دەکات.

### فێربـــــــە

**پەپوولەیەکی بچووك**

پەپوولەی شینی خاڵدار بە بچووکترین جۆری پەپوولەکان دادەنرێت درێژی هەریەکێکیان ١,٥٦٣ سم. نزیکراوەی ئەو درێژییە بۆ نزیکترین بەش لەسەد لە سانتیمەترێك چەندە؟ دەتوانرێ هێڵی ژمارەکان بەکاربهێنرێت بۆ نزیککردنەوەی ١,٥٦٣ بۆ نزیکترین بەش لەسەد.




کەواتە نزیککردنەوەی ١,٥٦٣ بۆ نزیکترین بەش لەسەد بریتییە لە ١,٥٦

### نموونە

٠,٤ ٥٣٧ بۆ بەهای ڕەنووسە شینەکە نزیکبکەوە.

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| ٠,٤٥٣٧　٥ < ٧ | ٠,٤٥٣٧　٥ > ٣ | ٠,٤٥٣٧　٥ = ٥ |
| ↓ | ↓ | ↓ |
| ٠,٤٥٤ بۆ بەرزتر نزیکبکەوە | ٠,٤٥ بۆ نزمتر نزیکبکەوە | ٠,٥ بۆ بەرزتر نزیکبکەوە |

### ساغبکـــەوە



١ **ڕوونیبکەوە** چۆن ڕێسای نزیککردنەوە بەکاردەهێنی بۆ نزیککرنەوەی ٨,٤٩ بۆ خانەی یەکان ، پاشان بۆ خانەی دەیەك.

**هەر ژمارەیەك بۆ بەهای ڕەنووسی شین نزیکبکەوە.**

٢ ٠,٧٨٣　٣ ٠,٢٥٦　٤ ٠,١٧٣٢

٥ ٠,٦٨٥　٦ ٠,٦٦

**٠,٦ ٢٨٥ بۆ خانەی دیاریکراو نزیکبکەوە.**

٧ دەیەك　٨ بەشەکان لەسەد

٩ بەشەکان لە هەزار　١٠ یەکان

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هەر ژمارەیەك بۆ بەهای ڕەنووسی شین نزیکبکەوە**

١١ ٣,١٩٣　　١٢ ٢٩,٤٢٣　　١٣ ٢,٠٤٧٥　　١٤ ٠,٨٦　　١٥ ١,٢٣٤

**٤٣٨ ٦,٥ بۆ خانەی دیاریکراو نزیکبکەوە.**

١٦ دەیەکەکان　　١٧ بەشەکان لەسەد　　١٨ بەشەکان لەهەزار　　١٩ یەکان

**ئەو خانەی ژمارەکەی بۆ نزیککراوەتەوە دیارییکە.**

٢٠ ٠,٥٦٢ بۆ ٠,٥٦　　٢١ ٦,٨٣٥٤ بۆ ٦,٨٣٥　　٢٢ ٨٠,١٥٤ بۆ ٨٠,٢

٢٣ ١,٧٥٩٢بۆ ١,٧٥٩　　٢٤ ٥,٩٢٧٣ بۆ ٦　　٢٥ ٢,٣٦٢٥ بۆ ٢,٣٦

**هەر ژمارەیەك بۆ خانەی دەیەکەکان نزیکبکەوە، پاشان بۆ خانەی یەکان.**

٢٦ ١٠,٥٦　　٢٧ ٢,٧٣　　٢٨ ٠,٩٨　　٢٩ ٥,٤٥

٣٠ ٤,٠٢　　٣١ ٣٢,٣٦　　٣٢ ٩,٤٩　　٣٣ ١٠,٩١

**بۆ نزیکترین بەش لەسەد نزیکبکەوە.**

٣٤ نۆسەد و سی و چوار بەش لەهەزار　　٣٥ ١٠ + ٥ + ٠,٢ + ٠,٠٦ + ٠,٠٠٢

٣٦ حەوت و هەشتا و سێ بەش لەهەزار　　٣٧ ٢ + ٠,٨ + ٠,٠٩ + ٠,٠٠٥ + ٠,٠٠٠٣

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** **خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٣٨ تا ٤٠ بەکاربهێنە.**




٣٨ بڕی هەنگوین لەشانەی ٥ بۆ نزیکترین دەیەك نزیکبکەوە

٣٩ کام دوو شانە بڕی هەنگوێنیان دوای نزیککرنەوە بۆ نزیکترین بەش لەسەد یەکسانن.

٤٠ کام شانە بڕی هەنگوینی بەنزیککراوەیی یەکسانە بەنزیکترین بەش لەسەدی ٠,٨٨ کگم.

٤١ **بنووسە** ڕوونبیکەوە چۆن ژمارە ٠,٩٩٩٩ بۆ نزیکترین بەش لەهەزار نزیکدەکەیتەوە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

٤٢
```
  ١٠٦ ٨٥٧
− ٩٨ ٢١٤
```

٤٣
```
  ٦٨ ٥٩١
+ ٨٩ ٧٢١
```

٤٤ لەگەورەترین بۆبچووکترین ڕیزبکە
١,٥٦ ؛١,٦٥ ؛١,٦

٤٥ ٢٥٦ + ٧١١ + ٣٠٤ = ▢

٤٦ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) تەمەنی جوان ١٥ ساڵە بە ٨ ساڵ لە ڕووناك گەورەترە، بەڵام ئاشنا بە ٢ ساڵ لە ڕووناك بچووکترە، تەمەنی ئاشنا چەندە؟

أ ٤ ساڵ　　ج ٦ ساڵ

ب ٥ ساڵ　　د ٧ ساڵ

وانەی ٤

# کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ژمارە دەیییەکان
# Adding and Subtracting Decimals



**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٤٠ + ٣٢١
2. ١٧ – ٦٤
3. ٢٠٣ + ١١٦
4. ٣٣٣ – ٩٦٩
5. ٩٥٦ + ٧٦٢ + ١ ٠٧٥

## فێربە

**ڕوانگەیەکی بچووک** محەمەد بڕی باران بارینی کە لەماوەی دوو ڕۆژدا لە شاری دهۆك بەم شێوەیە تۆمارکرد ١,٩٥ملم لە ڕۆژی یەکەم و ٠,٨٥ملم لە ڕۆژی دووەم بڕی باران بارین لە دوو ڕۆژەکەدا چەندە؟

**نموونە ١** کۆبکەوە ١,٩٥ + ٠,٨٥ بخەملێنە ٢ + ١ = ٣

**هەنگاوی ١** فاریزە و ڕەنووسەکان لە خانە دەیییەکان یەك لەژێر یەك دابنێ، بەشەکان لەسەد کۆبکەوە

$$\begin{array}{r} {}^{1}\phantom{0} \\ ١,٩٥ \\ +\ ٠,٨٥ \\ \hline ٠,٨٠ \end{array}$$

**هەنگاوی ٢** بەشەکان لەسەد کۆبکەوە

$$\begin{array}{r} {}^{1}\ {}^{1}\phantom{0} \\ ١,٩٥ \\ +\ ٠,٨٥ \\ \hline ٠,٨٠ \end{array}$$

**هەنگاوی ٣** یەکان کۆبکەوە، فاریزەکە لەسەرجەمدا دابنێ

$$\begin{array}{r} {}^{1}\ {}^{1}\phantom{0} \\ ١,٩٥ \\ +\ ٠,٨٥ \\ \hline ٢,٨٠ \end{array}$$

کەواتە بڕی باران بارین لە هەردوو ڕۆژەکەدا بریتییە لە ٢,٨٠ ملم. وەڵام ٢,٨٠ نزیکە لە وەڵامی خەملێنراو، کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

محەمەد بڕی باران بارینی لەماوەی دوو هەفتەدا لە دهۆك تۆمارکرد. ٢,٧٥ ملم لە هەفتەی یەکەم و ٤,٩ ملم لە هەفتەی دووەم.
چەند مللیمەتر باران لە هەفتەی دووەم زیاتر باریوە لەهەفتەی یەکەم؟



**نموونە ٢** لێدەربکە ٤,٩ – ٢,٧٥ بخەملێنە ٥ – ٣ = ٢

**هەنگاوی ١** فاریزەکان و ڕەنووسەکان لە خانە دەیییەکاندا دابنێ، سفر زیادبکە بۆئەوەی دوو ڕەنووس لە ڕاستی فاریزەکە بەدەست بهێنی بەشەکان لەسەد دەربکە. لەکاتی پێویستدا خوردبکەوە

$$\begin{array}{r} {}^{8\ 10} \\ ١,\not{9}\not{0} \\ -\ ٢,٧٥ \\ \hline ٠,٠٥ \end{array}$$

**هەنگاوی ٢** بەشەکان لەسەد لێکدەربکە لەکاتی پێویستدا خوردبکەوە

$$\begin{array}{r} {}^{8\ 10} \\ ٤,\not{9}\not{0} \\ -\ ٢,٧٥ \\ \hline ٠,١٥ \end{array}$$

**هەنگاوی ٣** یەکەکان لێدەربکە فاریزە لەجیاوازییەکاندا دابنێ

$$\begin{array}{r} {}^{8\ 10} \\ ٤,\not{9}\not{0} \\ -\ ٢,٧٥ \\ \hline ٢,١٥ \end{array}$$

کەواتە لەهەفتەی دووەم ٢,١٥ ملم زیاتر باریوە لە هەفتەی یەکەم. وەڵام ٢,١٥ نزیکە لە وەڵامی نزیککراوە. کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی ژمارە دەیییەکان کۆبکەیتەوە و لێکیاندەربکەیت، وەك چۆن لەگەڵ ژمارە سروشتیەکاندا دەتکرد، دوای ئەوەی کە فاریزەکانت یەك لەژێریەك دادەنا.

## ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە بۆچی دەتوانرێ سفر زیاد بکرێت بۆلای ڕاستی فاریزە، بێ ئەوەی بەهای ژمارەکە بگۆڕێت.

سەرجەم یان جیاوازی ئەژمێربکە. بخەملێنە بۆ ساغکردنەوە.

| ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ |
|---|---|---|---|---|
| ٠,٣ | ١٢,١ | ١,٢٣ | ١٠,٢ | ٢٣,٠٥ |
| ٠,٩ + | ٩,٠١ + | ٠,٤٧ − | ٨,٦٧ − | ٢,٨ − |

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

سەرجەم یان جیاوازی بنووسە پاشان پیتی شیاو بۆ هەر وەڵامێك لەخوارەوە بنووسە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم دێڕە شیعرە بدەیتەوە (چالاك و خێرا و ئازا و دەستوبرد دەرکە نازناوی دوو شاعیری کورد)

| خ | ە | و | ا | ر |
|---|---|---|---|---|
| ٢,١ | ٤٠,٨ | ٦,٠٠٨ | ٤٥,٩٠٣ | ١٣,٠٤٦ |
| ١,٧ + | ٢٥,٧ + | ١,٨٨٣ + | ٩,٣٧٤ + | ٠,٢٩٨ + |

| ش | د | پ | ف | ی |
|---|---|---|---|---|
| ١,٥ | ٧,٠٩ | ١٦,٦ | ٢٢,٦ | ٢١,٠٦ |
| ٠,٧ − | ٥,٦٤ − | ٧,٣٤ − | ٩,٤٥ − | ٩,٣٣ − |

ێ ١,٨٤ + ١,٩٢    ن ٥,٣ − ٢,٦٨    م ١٩,٠٧ − ١٢,٦

٩,٢٦ ١١,٧٣ ١٣,٣٤٤ ٦٦,٥ ٦,٤٧ ٣,٧٦ ١٣,٣٤٤ ١,٤٥    ٧,٨٩١ ٣,٨ ٥٥,٢٧٧ ٢,٦٢ ١١,٧٣

**جەبر** شێواز بدۆزەوە. ڕێساکە بنووسە. ڕێساکە بەکاربهێنە بۆ زیادکردنی دوو ژمارەی یەك لەدوای یەك لە شێوازەکەدا.

٧ ٢,٣ ؛ ٢,٥ ؛ ٢,٤ ؛ ٢,٦ ؛ ٢,٥ ؛ ▭ ؛ ▭

٨ ٤,٠٦ ؛ ٣,٩٦ ؛ ٤,٠١ ؛ ٣,٩١ ؛ ٣,٩٦ ؛ ▭ ؛ ▭

**هەڵە لەکوێدایە؟** شوان ٣,٢ + ١,٤٥ = ١,٧٧ ی نووسی هەڵەی شوان دیاریبکە. وەڵامی ڕاست بنووسە.

٩ **ئەندازە** پشتیوان ویستی کێڵگەیەکی لاکێشەیی درێژییەکەی ١٢٠م وپانییەکەی ٥٠م پەرژین بکات. درێژی پەرژینەکە چەندە؟

١٠ **ڕێنوێنی** بەبێ کۆکردنەوەی ٣٦,١٧٩ و ٨,٦٣ چۆن دەزانی، ڕەنوسی بەشەکان لەهەزار سەرجەمیان دەکاتە ٩؟

١١ نەوزاد ٩,٤٥ کگم ئاردی پێش نیوەڕۆ و ٣,٧٥ کگم لە دوای نیوەڕۆدا فرۆشت و ٧,٣٥ کگم ی لامایەوە. چەند کگم ئاردی لابووە؟

١٢ نانەوا خانەیەك ١,٣٤کم لە ماڵی سامان و ٠,٢٥کم لە ماڵی ئاریەوە دوورە. سامان لە ماڵەوە چوو بۆ نانەواخانەکە و پاشان چوو بۆ ماڵی ئاری. سامان چەند کیلۆمەتری بڕیوە؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١٣ ژمارەیەکی دەیی هاوتا بۆ ژمارە ٧,٥٨ بنووسە.

تەواوبکە.

١٤ ٣ × ٦ = ٤ + ▭    ١٥ ٦٣ − ٤٣ = ٢ × ▭

١٦ کۆڵکەکانی ژمارە ٢٥ بنووسە.

١٧ ٨٤٧ + ٩١٦    ١٨ ١٢٤٠ − ٦٢٣

پیتی گونجاو بۆ ئەو سێ ژمارەیە هەڵبژێرە کە لە شێوازەکەدان.

١٩ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ١,٨ ؛ ٢,٣ ؛ ٢,٠ ؛ ٢,٥ ؛ ٢,٢

أ ١,٩ ؛ ٢,٤ ؛ ٢,١    ج ٢,٧ ؛ ٢,٤ ؛ ٢,٩

ب ٢,٥ ؛ ٢,٢ ؛ ٢,٧    د ٢,٧ ؛ ٣,٢ ؛ ٣,٧

وانەی
٥

# سفر لە لێدەرکردندا

## Zeros in Subtraction



### پێداچوونەوەی خێرا

١ ١,٠٠ – ٠,٨٠ =
٢ ٣,٥٥ – ٣,٤٥ =
٣ ٤,٧٠ – ٢,٠ =
٤ ٨٠ – ٥,٠٩ =
٥ ٤,٧٥ بۆ خانەی یەکان نزیکبکەوە

### فێربە

**سەردان** ماڵی سالار ٦٠کم دوورە لە ماڵی هاوار کە لەشاری هەولێرە، هاوار چوو بۆ ماڵی سالار و لە دووری ٤٥,٩٨کم وەستا، هاوار چەند کیلۆمەتری ماوە بۆ ئەوەی بگاتە ماڵی سالار؟

### نموونە ١

لێدەربکە ٦٠,٠٠ – ٤٥,٩٨

بخەمڵێنە ٦٠ – ٤٦ = ١٤

پاشان ئەنجامی لێدەرکردنی تەواو ئەژمێربکە

```
 ٥ ٩ ٩ ١٠
 ٦٠,٠٠
–٤٥,٩٨
 ١٤,٠٢
```

- سفر زیادبکە بۆئەوەی خانەکانی ژمارە دەییەکان هاوتابن فاریزەکان لەژێر یەکتریدا دابنێ.
- لێدەربکە.
- فاریزە لە جیاوازیەکەدا دابنێ.

کەواتە هاوار ١٤,٠٢ کمی ماوە. وەڵام ١٤,٠٢ نزیکە لە وەڵامی خەمڵێنراو. کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

### نموونەی زیاتر

**أ** ٢,٩ – ٠,٧٤

```
   ٨ ١٠
 ٢,٩٠
–٠,٧٤
 ٢,١٦
```

سفر زیادبکە بۆئەوەی ژمارەیەکی هاوتا دەستبکەوێت.

**ب** ١,٦ – ٠,٣٤٢

```
    ٩
  ٥ ١٠ ١٠
 ١,٦٠٠
–٠,٣٤٢
 ١,٢٥٨
```

**ج** ١٠,٤٧٨ – ٩,٥٣

```
 ٩ ١٤
 ١٠,٤٧٨
– ٩,٥٣٠
 ٠,٩٤٨
```

**لەبیرت نەچێ** بۆئەوەی ژمارەی دەیەکی لێدەربکەی هەندێ جار پێویستیت بە نووسینی ژمارەی دەیەکی هاوتا هەیە ئەویش بە زیادکردنی چەند سفرێك بۆ لای ڕاستی ژمارە دەییەکە.

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن ٠,٢٥ لە ٣ دەردەکەی؟

**جیاوازی ئەژمێربکە.**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **٢** ٣,٩ − ٣,٢٥ | **٣** ٢,٠٨ − ٠,٧٤ | **٤** ٣,٠٠٧ − ٠,٤٥٦ | **٥** ٣٠٢,٣ − ١٩,٦٣٥ | **٦** ٢٥٠ − ١٩٥,٣٢ |

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**جیاوازی ئەژمێربکە.**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **٧** ١,٣ − ٠,٧٣ | **٨** ٣,٠٥ − ٢,٦ | **٩** ٤,٢ − ١,٠٢ | **١٠** ١٣٢,٥ − ٤١,٦٤٦ | **١١** ٧٢٠,٦٥٤ − ١١٨,٧٠٢ |

**١٢** ٢,٤٥ − ١,٣٩   **١٣** ١,٤ − ٠,٤٢٢   **١٤** ٢,١٠ − ١,٢٠

**١٥** ٥,٩٥ − ١,٩٩٤   **١٦** ٤,٧ − ١,٦١٦   **١٧** ٥,٣١ − ٢,٢٦

جەبر **بەهای هەر بڕێك ئەژمێربکە.**

**١٨** ٥,١ − (٠,١٥ + ١,١٠)   **١٩** ٢ + (٠,٥ − ٠,٢)

**٢٠** (٣,٦ + ١,٣) − ١,١   **٢١** ١٠,٢٥ + (١,٧٥ + ٥)

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** وێنە ڕوونکردنەوەییەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٢٢ تا ٢٤ بەکاربهێنە.

**خێرایی براوەکان لە پێشبڕکێی ئۆتۆمبێل**

| ساڵ | تێکرای خێرایی (کم/کت) |
|---|---|
| ٢٠٠٤ | ١٩٧,٩٥٦ |
| ٢٠٠٥ | ٢٠٣,٦١٦ |
| ٢٠٠٦ | ٢١٠,٨٧٢ |
| ٢٠٠٧ | ٢٠٧,٢٠٧ |



**٢٢** خێرایی براوەی ساڵی ٢٠٠٥ چەندی زیاتربوو لە خێرایی براوەی ٢٠٠٤؟

**٢٣** جیاوازی نێوان خێرایی براوەی ساڵی ٢٠٠٦ و ٢٠٠٧ چەندە؟

**٢٤** جیاوازی نێوان کەمترین و زۆرترین خێرایی چەندە؟

**٢٥** **پرسیار بنووسە** لەبارەی بەهای دراوی کاغەزی و جۆرەکانی کە دەتوانی لەجیاتی ١٠ هەزار دیناری بەکاربهێنی.

**٢٦** **پرسیارەکە چیە؟** درێژی ماجد ١,٣٢٥م و درێژی سانای خوشکی ١,٢٤٥م. وەڵام بریتییە لە ٠,٠٨م

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٧** ١,٣٦٠٩ بۆنزیکترین بەش لەهەزار نزیکبکەوە.

**٢٨** ٦٩ ٢٠١ − ٢٣ ٦٤١ = ■

**٢٩** ٧,٨٦٥ + ٠,٦٠٣ = ■

**٣٠** ٠,١٠٧٨ بە پیتی بنووسە.

**٣١** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە: لانە ١,٥٠کگم سێو و ٣,٤٥کگم ترێی کڕی و خۆخیشی کڕی، سەرجەم ٦,٧٥کگم میوەی کڕی. بارستایی خۆخەکە چەندبووە؟

أ ٢,٨٠ کگم   ج ١,٨٠ کگم

ب ٢,٢٥ کگم   د ٠,٩٠ کگم

وانەی ٦

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان

## وەڵامی نزیککراو یان وەڵامی تەواو

## Problem Solving Skills:

### Estimate Answer or Exact Answer

تێبگە | پلاندانی | شیکاربکە | ساغبکەوە



**پێداچوونەوەی خێرا**

٥٤٩ ٧١٤ نزیکبکەوە بۆ نزیکترین:

١ دە

٢ سەد

٣ دە هەزار

٤ هەزار

٥ سەد هەزار

**بیربکەوە** مەریوان ویستی بە پایسکیل دووری ١٢ کم ببڕێت لە قۆناغی یەکەم ٣,٩٨کم لە قۆناغی دووەم ٣,٧٩کم و لەقۆناغی سێیەم ٢,٣٩کمی بڕی. ئایا دووری داواکراوی بڕیوە؟ نەخێر چەند کیلۆمەتری ماوە ببڕێت؟ هەندێ جار پرسیار پێویستی بەوەڵامی تەواو هەیە. و هەندێ جاریش پێویستی بە وەڵامی نزیککراوە هەیە.



### پرسیار ١

ئایا مەریوان دووری داواکراوی بڕیوە؟

دەتوانی هەر دووریەك بەنزیککراوی بخەمڵێنی بۆ خانەی یەکان

٣,٩٨ ← ٤,٠٠

٣,٩٧ ← ٤,٠٠

+ ٢,٤٩ ← + ٢,٠٠

١٠,٠٠

هەر ماوەیەك بۆ خانەی یەکان نزیکبکەوە

١١ > ١٢. کەواتە مەریوان دووری دیاریکراوی نەبڕیوە.

### پرسیار ٢

بۆئەوەی بەتەواوی بزانی مەریوان چەندی ماوە ببڕێت، پێویستە ئەژمێری وەڵامە تەواوەکە بکەیت.

کۆبکەوە ٣,٩٨

٣,٧٩

+ ٢,٣٩

١٠,١٦

لێدەربکە ١٢,٠٠

– ١٠,١٦

١,٨٤

لەبەرئەوەی سەرجەمی تەواو بۆ هەرسێ دوورییەکە ١٠,١٦کم. پێویستە مەریوان دووری ١,٨٤کمی تر ببڕێت.

**باسبکە**

- مەریوان بۆچی لەکرداری خەملاندنەکە بۆ بەرزترین نزیککردەوە؟
- ئەو ووشە سەرەکییەی لە پرسیارەکەدا هاتووە کامەیە، ئەمەش پێویستی بە دۆزینەوەی وەڵامی نزیککراوە دەبێت؟

## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بڕیاربدە ئایا پێویستیت بە وەڵامی نزیککراوە یان وەڵامی تەواو هەیە؟ پاشان شیکاربکە.**

١ دانا ١٤ مەتر تەختەی لایە. ٧مەتری بۆ دروست کردنی سندوقێك و ٢,٥مەتری بۆ دروستکردنی مێزێك بەکارهێنا. چەند مەتر تەختەی لاماوە؟

٢ زانا حەوزێکی ماسی هەیە فراوانیەکەی ١٠لترە، چەندجار پێویستە سەتڵێك بەکاربهێنێ کەفراوانیەکەی ٢,٥لترە، بۆ پڕکردنی حەوزەکە.

٣ سالم ١٠م پەتی لایە بۆ پەرژینکردنی باخچەیەکی سێگۆشەیی کە درێژی لاکانی ٢,٧٩م و ١,٩٨م و ٣,٨٩م. ئایا پەتەکە بەشی پەرژینەکە دەکات؟

٤ ڕووناك ویستی ئاهەنگی نانخواردن لەماوەی ٣ کاتژمێردا ئامادەبکات بۆئەمەش پێویستی بە نزیکەی کاتژمێرێك هەیە بۆ ئامادەکردنی خواردەمەنی و ٤٠خولەك بۆ ڕێکخستنی ماڵ و ٣٠ خولەك بۆ ڕازاندنەوەی مێزی نانخواردن، ئایا ماوەی هەیە بۆ کڕینی گوڵ لەبازار پێش هاتنی میوانەکان؟

**مام قادر ٤٠م تەلی هەیە، دەیەوێت باخچەیەکی شێوە سێگۆشە پەرژین بکات کە درێژی لاکانی ١٢,٩٨م و ١١,٩٩م و ١٢,٩٥م.**

٥ کام پرسیار وەڵامی تەواوی پێویستە؟

أ ئایا مام قادر تەلی تەواوی بۆ پەرژینکردنی باخچەکە لایە؟

ب درێژی چێوەی باخچەکە بەنزیککراوەیی چەندە؟

ج چەندی لا دەمێنێتەوە؟

د کام دوولا درێژییەکانیان نزیکەی ٢٦ مەترە؟

٦ کام هاوکێشە ئەو تەلە دەنوێنێ کەلای مام قادر ماوەتەوە؟

أ ٤٠ − ٣٨ = ٢

ب ١٢,٩٨ + ١١,٩٩ + ١٢,٩٥ = ٣٧,٩٢

ج ١٣ + ١٢ + ١٣ = ٣٨

د ٤٠ − ٣٧,٩٢ = ٢,٠٨

## جێبەجێکردنە جیاوازەکان

**پێدراوەکانی ناو وێنەکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ٧ تا ١٠ بەکاربهێنە.**




٧ هانە لە ماڵەوە چوو بۆ قوتابخانە پاشان بۆ دەرمانخانە ئایا ماوەی ٦کمی زیاتر بڕیوە؟

٨ شێروان لەماڵەوە چووبۆ قوتابخانە پاشان بۆ مەڵبەندی بازرگانی ودواتر بۆ ماڵەوە وئینجا بۆ دەرمانخانە. ئەو ماوەیە کەبڕیویەتی چەندی لە ١٠کم زیاترە؟

٩ دلاوەر ٣,٥کم ڕۆیشت، چۆن ڕۆیشتووە؟

١٠ هیران لە دەرمانخانەوە چوو بۆ ماڵەوە پاشان بۆ مەڵبەندی بازرگانی. وەڵام ٥,٤کم. پرسیار چییە؟

١١ لەسەر ڕووداوێك کە داواکرابێت ئەژمێری سەرجەمی تەواوبێت یان جیاوازی تەواوبێت بنووسە. یان ڕووداوێکی تر کە وەڵامەکە بەنزیکی بێت.

## بەشی ٢

# پێداچوونەوە
# Review

| فاریزەی دەیی |
| --- |
| decimal point |
| وەڵامی تەواو |
| exact answer |
| وەڵامی شیاو |
| suitable answer |
| نزیککردنەوە |
| rounding |
| خەمڵاندن estimate |

### دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

**دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.**

١ کاتێك ژمارەکان لەپرسیارەکاندا پێش ئەژمێرکردن نزیکدەکەیتەوە بەمەبەستی ئەوەی ــــ؟ــــ وەڵامەکە بەدەست بێنی.

٢ ئەو هێمای کە خانەی یەکان لەخانە دەییەکان لە ژمارە دەییەکاندا جیادەکاتەوە بریتییە لە ــــ؟ــــ .

٣ بۆئەوەی دڵنیابی وەڵامەکەت شیاوە دەتوانی لەسەرەتادا ــــ؟ــــ بۆ سەرجەم یان جیاوازی بەکاربهێنی.

٤ بە بەکارهێنانی ڕێسای نزیککردنەوە دەتوانی ــــ؟ــــ ی ژمارەکان بکەی.

### دڵنیابوون لە کارامەییەکان

**هەر ژمارەیەك بۆ نزیکترین خانەی ڕەنووسە شینەکە نزیکبکەوە.**

٥ ٤٧,٢٨    ٦ ١ ٩٦٢    ٧ ٤٣٠٥,٦٢    ٨ ٨١٧ ٥١٠    ٩ ٤,٣٨١٩    ١٠ ٦١٤ ٢٢٣

**ژمارە ٥٨٣ ٧٤٥,١ نزیکبکەوە بۆ خانەی:**

١١ یەکان    ١٢ دەیەکان    ١٣ بەشەکان لەسەد    ١٤ بەشەکان لەهەزار

**سەرجەم یان جیاوازی بخەمڵێنە.**

١٥ ٥,٧٢ + ٨,٠٤    ١٦ ١٧,١٩ − ٥,٢    ١٧ ٢٥,٢٣ + ١٧,١٦    ١٨ ٣١٢,٧٥ − ١٩٩,٨٢    ١٩ ٦٤,٥٠٢ + ٣٤,٧٧١

**سەرجەم یان جیاوازی ئەژمێربکە.**

٢٠ ٥٤,٩٠ + ٨٢,٠٤    ٢١ ٣٢,٩ − ١٥,٨٥    ٢٢ ٦,٠٦٢ + ١٧,٥٨١    ٢٣ ٢٣,٠٠٩ − ٥,٣    ٢٤ ٠,٩٤ + ٦,٩٥٣١

### دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

**شیکاریبکە**

٢٥ سۆران و سالار و سەدار یاری ئەلیکترۆنیان دەکرد و ئەم خاڵانەیان تۆمارکرد ٧٢٥ و ٥١٠و ٢٢٥. سردار سێیەم نەبوو، سالار نزیکەی ٣٠٠ خاڵی زیاتر لە سۆران تۆمارکرد. ئایا هەریەکەیان چەند خاڵیان تۆمارکردووە.

٢٦ کام دوو ژمارە نزیککراوەکانیان یەکسانە ئەگەر نزیککرانەوە بۆ نزیکترین دەهەزاری.
٢٣٥ ٥٦٨؛ ٣٨١ ٥٦٢؛ ٩٢١ ٥٦٥.

**بڕیاربدە ئەگەر پێویستیت بە وەڵامی نزیککراوە یان وەڵامی تەواو هەیە، پاشان شیکاریبکە.**

٢٧ میران پێویستە تەنها ماوەی ٢٠ کم بە پایسکیل ببڕێت. ماوەی ٨,٩٥کم بڕی پاشان ٥,٢٥کم بڕی و ئینجا وەستا، ئایا دەتوانێ بچێت سەردانی ئامۆزاکەی بکات کە لەدووری ١٠کم.

٢٨ شاد پەتێکی هەیە درێژیەکەی ٢٠م پەرژینی باخچەیەکی شێوە سێگۆشەی پێکرد کە درێژی لاکانی ٨,٩٩م و ٣,٩٥م و ٥,٧٥م. چەند مەتر پەتی لاماوەتەوە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
# Standardized Test Prep

**ئاگاداربە! CAUTION!**

**وەڵامەکە هەڵبژێرە**

ئەگەر وەڵامەکەت نەگونجاو لەگەڵ هەریەك لە وەڵامەکان، دڵنیابە لە کرداری ئەژمێر کردنی وەڵامەکە، ئەگەر کرداری ئەژمێرکردنەکە ڕاست بوو، وەڵامەکەت دەوربدە «جگە لەوانە» سەیری پرسیاری ١ بکە.

**وەڵامی گونجاو بۆ پرسیاری ١ تا ٨ هەڵبژێرە.**

**١** نووسینی ژمارە ملیۆن و سەدهەزار و دوو سەد و پێنج دەیەك بە ڕەنووس کامەیە؟

أ ١ ١٠٠ ٢٠٠,٥    ج ١ ١٢٠ ٠٠٠,٥

ب ١ ١٠٠ ٢٠٥    د جگە لەوانە

**٢** نزیککراوەی ژمارە ١,٢٣٤٥ بۆ نزیکترین بەش لەهەزار کامەیە؟

أ ١,٢    ج ١,٢٣٤

ب ١,٢٣    د ١,٢٣٥

**٣**
٧١,٥٨
+ ٤٦,١٩

أ ١١٧,٧٧    ج ١١٧,٥٨

ب ١١٧,٦٧    د جگە لەوانە

**٤** کام ژمارە هاوتایە بۆ $\frac{٤٢}{١٠٠}$؟

أ ٤,٢    ج ٠,٤٢

ب ٤,٠٢    د ٠,٠٤٢

**خشتەکە بۆ شیکاری دوو پرسیاری ٥ و ٦ بەکاربهێنە.**




**٥** ژمارەی ئەسپەکان لە چین چەندی زیاترە لە ژمارەی ئەسپەکانی وولاتە یەکگرتووەکان؟

أ ١ ٧٠٤ ٨٠٠    ج ٢ ٧٠٤ ٨٠٠

ب ٢ ٦٠٤ ٨٠٠    د ١٥ ٠٠٤ ٨٠٠

**٦** نزیککراوەی ژمارەی ئەسپەکان لە بەرازیل بۆ نزیکترین سەدهەزار کامەیە؟

أ ٦ ٣٠٠ ٠٠٠    ج ٦ ٤٠٠ ٠٠٠

ب ٦ ٣٠٠ ٠٠٠    د ٦ ٤٩٠ ٠٠٠

**٧** کام ژمارە لە چل ملیۆن و شەست و پێنج هەزار و دوو کەمترە؟

أ ٤٠ ٦٥٠ ٠٠٢    ج ٤٠ ٠٦٥ ٠٠٢

ب ٤٠ ٥٦٠ ٠٠٢    د ٤٠ ٠٥٦ ٠٠٢

**٨** کام هێما ڕستە ژمارەییەکە تەواو دەکات؟

٥,٥٣٩ ⚪ ٥,٥٣

أ >    ب <    ج =    د ×

## ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know



**٩** کام لەدوو ژمارە ٠,٩٩ یان ٠,٩٩٩، نزیکە بۆ ژمارە ١؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

**١٠** ڕێبوار ٢٠م شریتی هەیە ٤,٥٠م لێکردەوە، ٦م لە براکەی وەرگرت. ٨,٢٥م دا بەخوشکەکەی. ئێستا ڕێبوار چەند مەتر شریتی لایە؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

**١١** ڕوونبکەوە چۆن ژمارەیەك بۆ نزیکترین ملیۆن نزیك دەکەیتەوە، ژمارەیەکی ٨ ڕەنووسی بنووسە، پاشان بۆ نزیکترین ملیۆن نزیکبکەوە.

بەشی ٣

# بڕەکان و کردارەکان
# Expressions and Operations

داڕێژراوێك لە چەند پارچە
دۆمینە بۆ مۆزەخانەی منداڵان



لە یەککەوتنی پارچە دۆمینەکان چالاکییەکە پشت بەدروستکردنی داڕێژراوێك لە پارچە دۆمینەکان دەبەستێت. لە یەککەوتنەکە شێوازێك دروستدەکات، خشتەکە ژمارەی پارچە دۆمینەی پێویست بۆ دروستکردنی ٣ داڕێژراوی بەرچاو دەنوێنێ.

پرسیارێك بۆ شیکار لەهەفتەی نیشتمانی ئەندازیاران چەند پارچە دۆمینەیان بەکارهێنا کە یەکسانبوو بە س جار لە ژمارەی ئەو دۆمینەی کە بەکارهات لە نموونەی یانەی مامۆستایان. هاوکێشەیەك بنووسە و پاشان بەهای س دیاریبکە.

| لەیەککەوتنی پارچە دۆمینەکان | | | |
|---|---|---|---|
| داڕێژراوی دۆمینە | مۆزەخانەی منداڵان | یانەی مامۆستایان | هەفتەی نیشتمانی ئەندازیاران |
| ژمارەی پارچەدۆمینە | ١٩٠٠ | ٣٠٠٠ | ٣٠٠٠٠ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

| |
|---|
| جیاوازی difference |
| دووکەوانە brackets |
| بڕە expression |
| کۆڵکە factor |
| سیفەتی ئاڵوگۆڕ Commutative property |
| ئەنجامی لێکدان product |
| ژمارەی نادیار detective number |

## زاراوەکان

**دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکە هەڵبژێرە.**

١ ن ___؟___ دەنوێنێ لە ١٢ − ٨ = ن.

٢ ن ___؟___ دەنوێنێ لە ٣ + ن = ٥.

٣ ___؟___ ئەو کردارە دەنوێنێ کە یەکەمجار لە ٦ +(٨−٢) جێبەجێدەکرێ.

٤ ___؟___ ڕستەیەکی ژمارەییە، ژمارکان وهێمای کردارەکان لەخۆدەگرێت.

٥ وەڵام لە پرسیاری لێکدان پێی دەوترێت ___؟___ .

## کۆکردنەوە و لێدەرکردن و لێکدان

**تەواوبکە.**

٦ ▢ = ١١ + ٣

٧ ▢ = ٦ + ١٢

٨ ٦ + ٨ = ▢

٩ ▢ = ٦ − ١١

١٠ ٥ = ▢ − ٨

١١ ٤ = ▢ − ١٠

١٢ ▢ = ٧ × ٦

١٣ ١١ × ٩ = ▢

١٤ ▢ = ٩ × ٥

## بەکارهێنانی دوو کەوانە

**ئەو بڕە هەڵبژێرە کە یەکسانە بە بەها دراوەکە.**

١٥ ٢٤
- أ (٢ × ٨) + ٤
- ب ٢ × (٨ + ٤)

١٦ ٠
- أ (٥ × ٣) − ١٥
- ب ٥ × (٣ − ١٥)

١٧ ١٢
- أ (٤ × ٠) + ١٢
- ب ٤ × (٠ + ١٢)

## سیفەتەکانی کۆکردنەوە

**ئەو پیتە بنووسە ئەو سیفەتە بنوێنێ کە بەکارهاتووە لەهەر ڕستەیەکی ژمارەییدا.**

أ سیفەتی ئاڵوگۆڕ ب سیفەتی پێکەوە بەستن ج سیفەتی سفر

١٨ ٩ + ٨ = ٨ + ٩

١٩ ٢٤ = ٠ + ٢٤

٢٠ (٣+٦) + ٥ = ٣ + (٦+٥)

٢١ ٤ + (١+٧) = (٤+١) + ٧

٢٢ ٢٣ + ٩ = ٩ + ٢٣

٢٣ ١٢ = ١٢ + ٠

## سیفەتەکانی لێکدان

**ئەو پیتە بنووسە ئەو سیفەتە بنوێنێ کە بەکارهاتووە لەهەر ڕستەیەکی ژمارەییدا.**

أ سیفەتی ئاڵوگۆڕ ب سیفەتی پێکەوەبەستن ج سیفەتی سفر د سیفەتی یەک

٢٤ ٨ × ٥ = ٥ × ٨

٢٥ (٥×٢)× ٤ = ٥ × (٢×٤)

٢٦ ٢٥ = ١ × ٢٥

٢٧ ٠ = ٠ × ٧٨

٢٨ ٤ × ١١ = ١١ × ٤

٢٩ (٥×٢) × ٨ = ٥ × (٢×٨)

وانەی ١

# بڕ و گۆڕاو

## Expression and Variable

فێربە



### پێداچوونەوەی خێرا

١ ٥ + ٣

٢ ٦ − ٢

٣ ١٠ + ٢ + ٨

٤ (٢+٧) − ٤

٥ ٩ − (٥+١)

### زاراوەکان

بڕ expression

گۆڕاو variable

### ماسیەکانی ناو حەوز

بڕ ڕستەیەکی بیرکارییە ژمارەکان و هێماکان بۆ کردارەکانی ئەژمێرکردن لەخۆدەگرێت، هەندێ جار گۆڕاوەکان. بەڵام هێمای یەکسانبوون لەخۆناگرێت.

١٥ + ٤ ‏ ‏ ‏ ‏ ٩ − ٧ ‏ ‏ ‏ ‏ (٨ + ٦) − ١١ ‏ ‏ ‏ ‏ ٣ × ٢

دەتوانی بڕ بنووسیت و بەهاکەی ئەژمێربکەی

### نموونە ١

بنار ١٢ ماسی لە حەوزێکدا هەیە و ٣ ماسی تری بۆ زیادکردن.

لەحەوزەکەدابوون بە چەند؟




کەواتە، ماسیەکان لەحەوزەکەدا بوون بە ١٥ ماسی

دەکرێ بڕەکە گۆڕاوێك لەخۆبگرێت. گۆڕاو پیت یان هێمایەکە ژمارەیەك دەنوێنێ. ئەم برانە گۆڕاو لەخۆدەگرێت.

٤ +س ‏ ‏ ‏ ‏ ز − ٥ ‏ ‏ ‏ ‏ ٦ ×ش ‏ ‏ ‏ ‏ ٣ + ت − ٢

دەتوانرێ گۆڕاو لەبڕێکدا بەکاربهێنرێ بۆ نواندنی ڕوداوێکی دیاریکراو.

### نموونە ٢

شاسوار ١٦ ماسی لەناو حەوزێکدا هەیە، هەندێکی دا بە براکەی بڕێك

بنووسە ئەم ڕووداوە بنوێنێ.



## نموونەی زیاتر

أ) سارا سەبەتەیەکی هەیە ١٥ بوتڵی شوشەی تێدایە و هەندێکیان شکاون.

گریمان ن = ژمارەی شووشە شکاوەکان.

| بوتڵەکانی ناو سەبەتەکە | | بوتڵە شکاوەکان |
|---|---|---|
| ١٥ | − | ن |

برەکە: ١٥ −ن

ئەگەر ژمارەی بوتڵە شکاوەکان ١٠ بێت. چەند بوتڵ لەناو سەبەتە ماوە؟

گریمان ن = ١٠

١٥ − ن

١٥ − ١٠ = ٥

٥ بوتڵ ماوەتەوە

ب) ١١ کەس ئەم هەفتەیە چوونە ناو تیپێکی وەرزشی.

گریمان س = ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەناو تیپە وەرزشییەکەدان.

| لەناو تیپەکەدان | | ئەوکەسانەی کەچوونە ناو تیپەکە |
|---|---|---|
| س | + | ١١ |

برەکە: س + ١١

ئەگەر ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەناو تیپەکەدا بوون ٢٣ کەس بن ئێستا ژمارەیان لەناو تیپەکەدا چەندە؟

گریمان: س = ٢٣

س + ١١

٢٣ + ١١ = ٣٤

٣٤ کەس لەناو تیپەکەدا هەیە.

ج) هاوار ١٨ کارتی تۆپی باسکەی لایە، هەندێکیانی بە ٣ کارتی تۆپی سەرمێز گۆڕیەوە.

گریمان ك = ژمارەی ئەو کارتانەی گۆڕیوەتەوە.

| کارتەکانی هاوار | | ئەو کارتەی گۆڕیویەتەوە | | ئەو کارتانەی کە لەئەنجامی گۆڕینەوە دەستکەتووە |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | − | ك | + | ٣ |

برەکە: ١٨ − ك + ٣

ئەگەر هاوار ٦ کارتی گۆڕیبێتەوە ئێستا چەند کارتی لایە؟

ك = ٦

١٨ − ك + ٣

١٨ − ٦ + ٣ = ١٥

هاوار ١٥ کارتی لایە.



## ساغبکەوە

١ **ڕێنوێنی** شاباز چەند ماسییەکی هەیە، ٣ ماسی تری کڕی، پاشان ١٠ ماسی فرۆشت. ڕوونیبکەوە بۆچی ٦ بەهایەکی شیاو نیە بو س لەبڕی (س+٣)−١٠؟

**برەکە بنووسە پاشان بەهاکەی ئەژمێربکە.**

٢ سیروان ١٠ قەڵەمی لایە، ٤ دانەی دا بە خوشکەکەی.

٣ پێنج خرایە سەر یانزە.

٤ ڕەنێو ٢٤ قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگی لایە ٦ دانەی بەکارهێنا و ١٢شی کڕی.

**برێك لەگەڵ گۆڕاوێك بنووسە. پاشان ئەو گۆڕاوە ڕوونبکەوە کە دەینوێنی.**

٥ لە دەفرێکدا ٩٦ گوێز هەیە، پەری هەندێکی خوارد.

٦ نزار ١٧ پوولی پۆستەی هەیە. براکەشی چەند دانەیەکی پێدا.

٧ لە دوکانی باپیر ١٢ یاری ئەلیکترۆنی هەیە. ٦ دانەی فرۆشت. پاشان چەند یارییەکی نوێی کڕی.



## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بڕەکە بنووسە پاشان بەهاکەی ئەژمێربکە.**

**٨** ١١ کەس بەشداریان لە پێشبڕکێی ئۆتۆمبیلدا کرد. ٧ی تریش چوونە ناویان.

**٩** ماجید ١٧ گوێچکە ماسی هەیە ٥ دانەی دابە هاوڕێکەی.

**١٠** لە دوکانی موحەمەد ١٠ چەپکە گوڵ هەیە، ٢ چەپکی فرۆشت.

**١١** لە پەرتووکخانەی شاسوار ٢٣ کتێب هەیە، ١٣ دانەی دابە خوشکەکەی و ٧ دانەی نوێی لەباوکی وەرگرت.

**١٢** لەسەر مێزێك ٢١ پەرداخ هەیە، ٣ دانە کەوتوو شکا پاشان ٦ی تر خرایە سەر مێزەکە.

**بڕێك لەگەڵ گۆڕاوەکەی بنووسە. پاشان ئەوەی گۆڕاوەکە دەینوێنێ ڕوونیبکەوە.**

**١٣** شارۆ ٣٧ هەڵماتی لایە، هەندێکی ونکرد.

**١٤** بەرهەم چەند کتێبێکی کڕی و باوکی ٩ کتێبی نوێی دایە.

**١٥** ١٤ قەڵەمت کڕی، هەندێکیانت بەکارهێنا. ٣ دانەت دابە خوشکەکەت.

**١٦** دوکاندارێك ٧٣ قەڵەمی لایە. هەندێکی فرۆشت.

**١٧** هۆما چەند قەلەمێکی هەیە، دووانیانی شکا و دایکیشی ٦ قەڵەمی پێدا.

**١٨** ئیبراهیم ٢٦ باڵۆنی هەیە، ٩ دانەی وونکرد و ژمارەیەکی تری کڕی.

**بەها بڕەکە ئەژمێربکە.**

**١٩** ٥٠ + س، کە س = ٢٠

**٢٠** ن+ ٣٦٠٠، کە ن = ٤٠٠

**٢١** ن − ٣٥، کە ن = ١٠٠

**٢٢** ٢٠٠٠ − س، کە س = ١٠٠٠

**٢٣** ١٠ + (٤ − م)، کە م = ٢

**٢٤** (٢٢ + ن) − ٤، کە ن = ٨

**بڕی گونجاو لەهەردوو پرسیاری ٢٥، ٢٦ هەڵبژێرە.**

**٢٥** پلەی گەرمی ١٠ پلە دابەزی، پاشان ٤ پلە بەرزەوە بوو.

أ (ت + ١٠) + ٤

ب (ت − ١٠) + ٤

ج (١٠ − ت) + ٤

د (ت + ١٠) − ٤

**٢٦** پاسێك ٢٣ کەسی تێدابوو، ٥ کەس لەشوێنی وەستان دابەزین و چەند کەسێکی تر سەرکەوتن.

أ (ب + ٢٣) + ٥

ب (ب − ٢٣) + ٥

ج (٢٣ − ب) + ٥

د (٢٣ − ٥) + ب

**بڕەکە بۆ تەواوکردنی هەر خشتەیەك بەکاربهێنە.**

**٢٧**

| س | س+٦ |
|---|---|
| ٤ | ١٠ |
| ٥ | ١١ |
| ٦ | |
| ٧ | |

**٢٨**

| س | س−٣ |
|---|---|
| ٨ | ٥ |
| ١٢ | |
| ١٦ | |
| ٢٠ | ١٧ |

**٢٩**

| س | ٢٠−س |
|---|---|
| ٥ | |
| ٨ | ١٢ |
| ١٠ | |
| ١٥ | |

**٣٠** لەند ماوەی ١,٢٩کم بڕی لە ڕۆژی یەکەم، دووئەوەندە لەڕۆژی دووەم، ئەوەی لە ماوەی سێ ڕۆژدا بڕی ٥,٧٦کم بوو، لە ڕۆژی سێیەمدا چەند ماوەی بڕیوە؟

**٣١** دڵشاد بە ٢ ساڵ لە تەمەنی سەرانی هاوڕێی گەورەترە ئەگەر س = بە تەمەنی سەران، ئەو بڕە چەندە کە تەمەنی دلشاد دەنوێنی؟ ئەگەر تەمەنی سەران ١٢ ساڵ بێت. تەمەنی دڵشاد چەندە؟

**٣٢** **هەڵە لەکوێدایە؟** جەمال ئەڵێ : س + ١٧ بڕێکە ئەم شێوازە تەواو دەکات:
س+ ١٨؛ س+ ١٥؛ س+ ١٦؛ س+ ١٣؛ س+ ١٤؛ ▢ هەڵەی جەمال دیارییکە وەڵامی ڕاست بنووسە.

**٣٣** **پێوان** لە ساڵی ٢٠٠١ جوامێر لە پێشبڕکێی ئۆتۆمبیلدا سەرکەوت. خێراییەکەی ٣٠٤,١٤٤ کم/کت لەساڵی ٢٠٠٢ خێرایی سەرکەوتووکە ٠,٠١٨ کم/کت لەسەر خێرایی جوامێر زیادکرد وە لە ساڵی ٢٠٠٣ خێرایی سەرکەتووکە ٠,٧٠١ کم/کت لەسەر خێرایی سەرکەوتووی ساڵی ٢٠٠٢ زیادیکرد. خێرایی سەرکەوتووکەی ساڵی ٢٠٠٣ چەندە؟

**٣٤** **بنووسە** بڕێك بۆ ئەم پرسیارەی دێت بنووسە. گۆڕاوەکە چی دەنوێنێ دیاریکە.
هانا ٧ کارتی لایە، هەندێکی دابە خوشکەکەی و ٥ کارتی لە براکەی وەرگرت.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٣٥** ئەژمێرکردنی هزری بۆ دۆزینەوەی سەرجەم بەکاربهێنە. ٣٠ + ٤٠ + ٥٠٠ + ٢٠٠

**٣٦** ژمارە دەیی هاوتا بۆ ٩,٠٩ بنووسە.

**٣٧** گەورەترین ژمارە پێکهاتبێ لە ٧ ڕەنووسی جیاواز بنووسە.

**٣٨** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — کام ژمارەی بچووکترە لە ١٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠

أ ٣ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ ج ٣٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠
ب ١ ٠٠٠ ٠٠٠ ٠٠٠ د ٣٠ ٠٠٠ ٠٠٠

**٣٩** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — کام ژمارە دەکەوێتە نیوان ٠,٥٦ و ٠,٥٧؟

أ ٠,٥٥ ج ٠,٥٦٥
ب ٠,٥٥٥ د ٠,٥٧٥

## شیکاری پرسیارەکان — گۆشەی ڕوو ناکبیران

**مەتەڵەکە شیکاربکە** کارزان بڕوانامەیەکی دۆزییەوە کە مەتەڵێکی تێدابوو. توانی هەندێك لە ژمارەکان و دوو نیشانە بۆ کردارەکانی ئەژمێرکردن لەناویا دیاری بکات، بۆی دەرکەوت کە ●، ● دوو کرداری ئەژمێرکردنی جیاوازن ●، ●، ● بریتین لە سێ ژمارەی جیاواز کە دەکەونە نێوان ١ و ٩.




**١** لەگەڵ هاوڕێیەکت کاربکە بۆ دیاریکردنی ژمارەکان و کردارە ئەژمێرییەکان.

**٢** ئەوەی دۆزیتەوە بەکاریبێنە بۆ داڕشتنی مەتەڵێکی نوێ لەگەڵ هاوڕیکەتدا.

وانەی ٢

# هاوکێشەکان

## Equations

### فێربە

**ئابووری** گۆران پێویستی بە ٣٢ پاسکیل هەیە بۆ دوکانەکەی ئێستا تەنها ٧ پاسکیلی هەیە، پێویستی بە چەندی تر هەیە؟

هاوکێشەیەك بنووسە بۆ نواندنی پرسیارەکە.

**هاوکێشە** ڕستەیەکی ژمارەییە نیشانەی یەکسانی تێدایە واتە یەکسانی نێوان دوو هێند نیشان دەدات.

گۆڕاوی س بەکاربهێنە بۆ نواندنی ژمارەی پاسکیلەکان کە پێویستە گۆران بکڕێت.

| ژمارەی پاسکیلەکان کە هەیەتی | + | ژمارەی پاسکیلەکان کە پێویستیەتی | | ژمارەی پاسکیلەکان بۆ دوکانەکەی |
|---|---|---|---|---|
| ↓ | | ↓ | | ↓ |
| ٧ | + | س | = | ٣٢ |

کەواتە، هاوکێشەکە بریتییە لە ٧ + س = ٣٢

### نموونەکان

**أ** کەماڵ ١٢ پولی پۆستەی هەیە لەیادی لەدایکبوونیدا کۆمەڵێکی تری بۆ هات، ژمارەکە بووبە ٣٢ پوول. کەماڵ چەند پوولی لە یادی لەدایکبوونیدا بۆ هاتووە

| ١٢ پوول | + | پوولی جەژنی لەدایکبوون | = | ٣٢ پوول |
|---|---|---|---|---|
| ↓ | | ↓ | | ↓ |
| ١٢ | + | ب | = | ٣٢ |

**ب** ئارام ٥ پەپکەی سی دی دا بەبراکەی و ٧ دانەی لامایەوە. چەند پەپکەی لابووە.

| ژمارەی پەپکەکان کە لایبووە | − | ٥ | = | ٧ |
|---|---|---|---|---|
| ↓ | | ↓ | | ↓ |
| س | − | ٥ | = | ٧ |

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی هاوکێشەیەك بنووسی کە دووبڕی یەکسان بنوێنێ.

### ساغبکەرەوە

١ ڕوونیبکەوە هاوکێشە بەچی لە بڕ جیادەکرێتەوە؟

**هاوکێشەیەك بنووسە. ئەوەی گۆڕاوەکە دەینوێنێ ڕوونیبکەوە.**

٢ هاوار ٢٤ قەڵەمی لایە، هەندێکی لەسەر مێزێك دانا و ١١ قەڵەمی لەلا مایەوە، چەند قەڵەمی لەسەر مێزەکە داناوە؟

٣ ساکار چەند قەڵەمێکی لایە، باوکی ٥ قەڵەمی نوێی دایە، ژمارەیان بووبە ١٢ قەڵەم. ساکار چەند قەڵەمی لابووە؟

---

**پێداچوونەوەی خێرا**

به پیتی بنووسە

١ ٧ =٥+٢

٢ ٦ =٢−٨

٣ ١٣=٢+١١

٤ ٩−٢١ =١٢

٥ ١٣ = ٥+٢+٦

**زاراوەکان**

هاوکێشە equation

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هاوکێشەیەك بنووسە. ئەوەی گۆڕاوەکە دەینوێنێ ڕوونبکەوە.**

**٤** شۆخان ١٦ مورووی هەیە، پێویستی بە ٢٤ موروە بۆ دروستکردنی بازنێك، چەند مورووی تری پێویستە؟

**٥** بەور (پڵنگ) بەخێرایی ٧٠ کم/کت ڕادەکات، بەڵام شێر بەخێرایی ٥٠ کم/کت ڕادەکات. جیاوازی نێوان خێرایی پڵنگ و شێر چەندە؟

**٦** سۆران قوتوویەك پەپکی کڕی ٢٠ دانەی تێدابوو. ٣ دانەی دابە براکەی و ٥دانەشی بەکارهێنا. چەند پەپکی لا مایەوە؟

**٧** ژمارەیەك لە ٢٢ دەربکە، پاشان ٥ی لەگەڵدا کۆبکەوە و ١٠ بەدەست دەهێنی. ژمارەی دەرکراو چەند بوو؟

**٨** پلەی گەرمی ١٥ پلە بەرز بووەوە و گەیشتە ٤٨ پلە پلەی گەرمی سەرەتا چەند بووە؟

**٩** پاش کشانەوەی ٧ یاریزان لە تیپێکی وەرزشی. ژمارەیان بووبە ٣٠ یاریزان، ژمارەی یاریزانانی تیپەکە چەند بوو؟

**پرسیارێك بۆ ئەم هاوکێشیە بنووسە. گۆڕاوی ن چیدەنوێنێ دیاریبکە.**

**١٠** ٣١ − ن = ٢٠

**١١** ن + ٥ = ١٣

**١٢** (٦ + ن) − ٤ = ١٧

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی بەکاربهێنە بۆ نووسینی هاوکێشەیەك لەگەڵ گۆڕاوێك لە پرسیارەکانی ١٣ تا ١٥.




**١٣** جیاوازی نێوان نمرەی شاد و نمرەی توانا چەندە؟

**١٤** ئەگەر سەرجەمی نمرەکانی شێرزاد و بەشداربوویەکی تر ١٧ خاڵ بێت، نمرەی بەشداربووەکەی تر چەندە؟

**١٥** ئەگەر بەرزترین نمرە ٢٥ بێت. موحەمەد پێویستی بە چەند نمرەی تر هەیە تا بگات بەو نمرەیە؟

**١٦** **ئەندازە** چوارگۆشەیەك درێژی لایەکی ن سم و چێوەکەشی ١٦ سمە. هاوکێشەیەك بۆ چێوەی ئەو چوارگۆشەیە بنووسە؟

**١٧** میران لە کاتژمێر ١:١٥د.ن گەیشتە بازار، ماوەی ٤٥ خولەکی لە شەقامی کاوە بەسەر برد و ٣٥ خولەك لە شەقامی مەولەوی و کاتژمێرێك و ١٠ خولەکیش لە شەقامی پیرەمێرد.پاشان ڕۆیشت بۆ ماڵەوە. میران لەچ کاتژمێرێکدا بازاری بەجێهێشت؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**١٨** برێك بۆ ئەم بارە بنووسە. پلەی گەرمی ٥ پلە بەرزبۆوە.

**١٩** ٧ × ٤

**٢٠** ٦ × ٩

**٢١** ئەژمێری هزری بۆ ئەژمێری سەرجەم بەکاربهێنە ٦ + ١٣ + ٧ + ٢٤

**٢٢** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — لەکام ژمارەدا بەهای ڕەنووسی ٦ گەورەترە؟

أ ٥٦ ٩٥٣

ب ٢ ٥٦٠ ٣٣٣

ج ٣٦ ٥٣١ ٢٢٨

د ٤ ٥٢٣ ٦٣٥ ٢٠٠

وانەی
# ٣

# شیکاری هاوکێشەکان

## Solving Equations

**پێداچوونەوەی خێرا**

بەهای هەربڕێك ئەژمێربکە ئەگەر ن = ٥.

١ ن + ٧
٢ ٢ × ن
٣ ٢٥ ÷ ن
٤ ن − ٢
٥ (١١ + ن) − ١٢

**زاراوەکان**

شیکار Soultion

**فێربـــــه**

**خەوی درێژخایەن** زۆربەی کاتی ڕۆژ وورچی کوالا دەخەوێت. بە هۆی جۆری سیستمی خواردنی کە وزەی کەمە ئەویش ئەوەیە پشت بە خواردنی گەڵا دەبەستێت. ڕۆژانە نزیکەی ٢٢ کاتژمێر دەخەوێت. ڕۆژێ چەند کاتژمێر بەئاگایە؟ هاوکێشەیەك بنووسە ئەم بارە بنوێنێ.

کاتژمێری خەوتن + کاتژمێری بەئاگابون = کاتژمێرەکان لە ڕۆژێکدا

٢٢ + ن = ٢٤

ئەگەر هاوکێشەکە گۆڕاوێکی تێدابێت، دەکرێت شیکار بکرێت بە دۆزینەوەی بەها بۆ گۆڕاوەکە، هاوکێشەکە هاوسەنگ دەکات، شیکاری هاوکێشەکە بریتییە لە بەهای ئەو **گۆڕاوە**.

کام لەمانە شیکارە بۆ هاوکێشەکە: ١ یان ٢ یان ٥؟

| ن بگۆڕە بە ١ | ن بگۆڕە بە ٢ | ن بگۆڕە بە ٥ |
|---|---|---|
| ٢٢ + ١ ≟ ٢٤ | ٢٢ + ٢ ≟ ٢٤ | ٢٢ + ٥ ≟ ٢٤ |
| ٢٣ = ٢٤ هەڵەیە | ٢٤ = ٢٤ ڕاستە | ٢٧ = ٢٤ هەڵەیە |

شیکارەکە بریتییە لە ٢،لەبەرئەوەی ٢٢ + ٢ = ٢٤.

کەواتە ماوە بەئاگابوونی وورچی کوالا ڕۆژانە دوو کاتژمێرە.

▼ وورچی کوالا ڕۆژانە نزیکەی دەیەکی بارستایی خۆی گەڵای کالیپتۆس دەخوات.



**نموونە**

أ کام لەمانە: ٤ یان ٥ یان ٧ دەبێتە شیکار بۆ هاوکێشەی ٣+ ن =١٠؟

٣ + ٤ = ١٠ ، ن بگۆڕە بە ٤
٧ = ١٠ هەڵەیە
٣ + ٥ = ١٠ ، ن بگۆڕە بە ٥
٨ = ١٠ هەڵەیە
٣ + ٧ = ١٠ ، ن بگۆڕە بە ٧
١٠ = ١٠ ڕاستە
کەواتە، ن = ٧

ب کام لەمانە: ١٠یان ١١یان ١٣دەبێتە شیکار بۆ هاوکێشەی ن −٦=٧؟

١٠ − ٦ = ٧ ، ن بگۆڕە بە ١٠
٤ = ٧ هەڵەیە
١١ − ٦ = ٧ ، ن بگۆڕە بە ١١
٥ = ٧ هەڵەیە
١٣ − ٦ = ٧ ، ن بگۆڕە بە ١٣
٧ = ٧ ڕاستە
کەواتە ، ن = ١٣

## ئەژمێرکردنی هزری

ڕزگار لەگەڵ خێزانەکەیدا دوو هەفتەی لە ئوسترالیا بەسەربرد. لەهەفتەی یەکەمدا ١٣ وورچی کوالای بینی و لە هەفتەی یەکەم و دووەمدا ٢٢ وورچی بینی. چەند وورچی کوالای لەهەفتەی دووەمدا بینیووە؟



هاوکێشەیەك بۆ شیکاری پرسیارەکە بنووسە.

| وورچی کوالا لەهەفتەی یەکەمدا | + | وورچی کوالا لە هەفتەی دووەمدا | = | وورچی کوالا لە هەردوو هەفتەدا |
|---|---|---|---|---|
| ↓ | | ↓ | | ↓ |
| ١٣ | + | ب | = | ٢٢ |

دەتوانی هاوکێشەکە بە ئەژمێرکردنی هزری شیکاربکەی.

١٣ + ب = ٢٢   **بیربکەوە:** ١٣ کۆی چ ژمارەیەك یەکسانە بە ٢٢؟

ب = ٩

**ساغبکەوە:** ١٣ + ٩ = ٢٢   ب بگۆڕە بە ٩

٢٢ = ٢٢ √ هاوکێشەکە ڕاستە. بەهای ب بریتییە لە ٩.

### نموونە

**أ**

٥ + ب = ١٢   **بیربکەوە:** ٥ کۆی چ ژمارەیەك یەکسانە بە ١٢؟

ب = ٧

**ساغبکەوە:** ٥ + ٧ = ١٢

١٢ = ١٢ √

**ب**

١٧ − ن = ٧   **بیربکەوە:** ١٧ کەم چ ژمارەیەك یەکسانە بە ٧؟

ن = ١٠

**ساغبکەوە:** ١٧ − ١٠ = ٧

٧ = ٧ √

**لەبیرت نەچێ** بەهای ئەو گۆڕاوەی کەوا دەکات هاوکێشەکە ڕاست بێت بریتییە لە شیکاری هاوکێشەکە.

### ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن دەزانی بەهای ژمارەیەك بۆ گۆڕاوەکە لە هاوکێشەیەکدا بریتییە لە شیکار.

**کام لەم ژمارانە ٦ یان ٨ یان ١١، شیکاری هاوکێشەکەیە؟**

**٢** ٩ + ن = ١٧   **٣** س − ٢ = ٩   **٤** س + ٧ = ١٣   **٥** ١١ − س = ٣

**کام لەم ژمارانە ٣ یان ٥ یان ١٥، شیکاری هاوکێشەکەیە؟**

**٦** ن + ١٠ = ١٥   **٧** ٤ + س = ١٩   **٨** ٢١ = ی + ١٨   **٩** ١٦ − ن = ١١

**ئەژمێری هزری بۆ شیکاری هاوکێشەکە بەکاربهێنە. شیکارەکە ساغبکەوە.**

**١٠** ٨ + ن = ١٥   **١١** ٢٥ − ن = ٥   **١٢** ٦٠ − ن = ٥٢   **١٣** ن + ١٠ = ٧٢

**١٤** ٨ = ن + ٤   **١٥** ن − ٧ = ٣٠   **١٦** ٣٦ = ن − ١٠   **١٧** ن + ٦ = ١٣

## راهێنان و شیكاری پرسیارەكان

**كام لەم ژمارانە: ٥، یان ٧، یان ١٢، شیكارە بۆ هاوكێشەكە؟**

| | | |
|---|---|---|
| **١٨** ٤ + ن = ١١ | **١٩** ن + ٦ = ١٨ | **٢٠** ٥٣ − ت = ٤٨ |
| **٢١** ٢ = ن − ١٠ | **٢٢** ن = ٢ + ٥ | **٢٣** ٤٥ − ٣٨ = ت |
| **٢٤** ١٦ = س + ٩ | **٢٥** ی = ٢٣ − ١٨ | **٢٦** ٣٧ − ٢٥ = ب |

**ئەژمێركردنی هزری بۆ شیكاری هاوكێشەكە بەكاربهێنە. شیكارەكە ساغبكەوە.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| **٢٧** ١١ = ت + ٥ | **٢٨** م − ٣ = ٢٠ | **٢٩** ك + ٩ = ٢٦ | **٣٠** ٣٢ = ١٠ + ت |
| **٣١** ت + ٨ = ١٤ | **٣٢** ١٥ = م − ٩ | **٣٣** ك + ٣٥ = ٤٨ | **٣٤** (ت − ٢٤) + ٣ = ٧ |

**هاوكێشەكە شیكاربكە. شیكارەكە ساغبكەوە.**

| | | | |
|---|---|---|---|
| **٣٥** ٢٥ + ت = ٣١ | **٣٦** س − ١٧ = ٨ | **٣٧** ٢٦ − س = ١٣ | **٣٨** ٧ + (س + ٢) = ١٨ |
| **٣٩** ٣٠ = ٧ + ب | **٤٠** س = ١٢ − ٩ | **٤١** ٥١ − ١٨ = س | **٤٢** س = ١٠ + ٤٣ |
| **٤٣** س + ٩ = ٢٦ | **٤٤** ٢٩ − ب = ٧ | **٤٥** ٧٢ + ٥٤ = د | **٤٦** ٤٤ = ٥٢ − ب |

**ڕێنوێنی** لە پرسیاری ٤٧ تا ٥٠ هەر هێمایەك ژمارەیەك دەنوێنێ بەهای هەر هێمایەك دیاریبكە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| **٤٧** ❤ + ٣ = ٩ | **٤٨** ▲ + ٦ = ١٠ | **٤٩** ١٢ − ♦ = ٧ | **٥٠** ٥ = ١٢ − ● |
| ٤ + ★ = ❤ | ▲ − ♣ = ١ | ♦ + ■ = ٦ | ● + ◀ = ١٥ |

**ستوونە ڕوونكردنەوەییەكان بەكاردێن بۆ نووسینی هاوكێشە لەڕاهێنانی ٥١ تا ٥٤ پاشان هاوكێشەكە شیكاربكە.**

**٥١** پشیلە لەڕۆژێكدا چەند كاتژمێر بەئاگایە؟

**٥٢** كام گیانەوەر لەڕۆژێكدا چوارئەوەندی ژمارەی كاتژمێرەكانی نووستنی ئەسپ دەخەوێ؟

**٥٣** شێر چەند كاتژمێر زیاتر لە مانگا دەخەوێ؟

**٥٤** كام گیانەوەر ٥ كاتژمێر زیاتر لە ئەسپ لە ڕۆژێكدا دەخەوێ؟

**٥٥** **پرسیار چییە؟** سۆران ٩ گیانەوەری هەیە: ٤ مریشك و دوو مراوی و چەند ئەسپێك. سۆران هاوكێشەی ٦+ ن =٩ بەكارهێنا. وەڵام ٣ ئەسپ.

**٥٦** **ڕێنوێنی** كارمەند ١١٣ پارچە دراو لە جۆری ١٠٠٠ دیناری و ١٣ پارچە لە جۆری ١٠٠٠٠ دیناری و ٩ پارچەش لە جۆری پێنج هەزاری دا بەهەردوو براكەی فریا و فەرمان. بەشی هەریەكەیان چەندە ئەگەر براكانی بەیەكسانی دابەشی بكەن؟



## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٥٧** بڕێك بنووسە ئەم بارەی خوارەوە بنوێنێ:
دانا ٥ پەپكەی لە زانا زیاتر لایە.

**٥٨** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە نزیككردنەوەی ١,٠٣٩٥ بۆ نزیکترین بەش لەسەد کامەیە؟

أ ١,٠٣ ج ١,٠٤
ب ١,٠٣٩ د ١,١٤

**٥٩** ٢,٠٨ + ٠,٩ = ■ **٦٠** ١,٠٧ − ٠,٥٩ = ■

**٦١** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە لاقە ١١٠ هەزار دیناری پاشەکەوت کرد ٨٦ هەزار دیناری زیاترە لە دووئەوەندەی هانە کە پاشەکەوتی کردبوو. هانە چەند دیناری پاشەکەوت کردووە؟

أ ١٢ هەزار دینار ج ٢٤ هەزار دینار
ب ١٨ هەزار دینار د ٣٠ هەزار دینار

## شیکاری پرسیارەکان دەروازەیەك لەسەر مێژوو

هێماکانی بیرکاری لە سەدان ساڵ لەمەوپێش بەکارهاتووە. پسپۆڕی بیرکاری تۆماس هاریۆت، بە ڕەگەز ئینگلیزە، یەکەم کەس بوو کە دوو هێمای < و > لە کتێبەکەیدا لەساڵی ١٦٣١ز بەکارهێنا. بەڵام بیاربوغیری فرەنسی یەکەمین کەس بوو لە ساڵی ١٧٣٤ ز کە دوو هێمای ≤ بچووکتر یان یەکسان و ≥ گەورەتر یان یەکسانی بەکارهێنا. دەتوانرێ دوو هێمای ≤ یان ≥ بۆ دەرخستنی پەیوەندییەکان بەکاربهێنرێت.

٥ ≤ ٥ دەخوێندرێتەوە ٥ بچووکتر یا یەکسانە بە ٥
٧ ≥ ٢ دەخوێندرێتەوە ٧ گەورەتر یا یەکسانە بە ٢
ن ≤ ٩ دەخوێندرێتەوە ن بچووکتر یا یەکسانە بە ٩

ئەگەر ن ≤ ٩، کەواتە بەهای ن ژمارەیەکە بچووکترە یا یەکسانە بە ٩ ئەگەر ن ژمارەیەکی سروشتی بێت. بەهاکەی ٠ یان ١ یان ٢ یان ٣ یان ٤ یان ٥ یان ٦ یان ٧ یان ٨ یان ٩ دەبێت.



▲ وتراوە کە چەمکی دوو هێمای < یان > بە بیری تۆماس هاریۆت داهاتووە، دوای بینینی ئەم وێنەیەی کە هاوڵاتییەکی ئەمریکی دروستی کردبوو لەکاتی جێبەجێکردنی ڕاپرسی لە ئەمریکای باکور.

ئەو ژمارە سروشتیانە بنووسە کە دەکرێ گۆڕاوەکان بنوێنێ.

**١** ن ≤ ٥ **٢** س ≤ ٢ **٣** ت ≥ ٨ **٤** س < ١٠ **٥** س ≥ ٠

**گۆڕاوێك و هێمای ≤ یان ≥ بەکاببهێنە بۆ نووسینی ڕستەیەکی بیرکاری کە ڕستەیەکی پیتی بنوێنێ.**

**٦** هەموو ژمارەکانی س بچووکترە یان یەکسانە بە ٧ **٧** هەموو ژمارەکانی س گەورەترە یا یەکسانە بە ١٢

وانەی ٤

# بەهای بڕ
## Expression Value



**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ١٠٠ − ١
2. ٢٥ + ١٠
3. ٤٦ × ١٠
4. ٢٠٠ ÷ ١٠
5. ٢٠٠ − ١٩

**فێربە**

**ڕیز بە ڕیز** داستان ٤ ڕیز پارچە دۆمینەی ڕێکخست، لە هەر ڕیزێکدا هەمان ژمارەی لە پارچەکان دانا، دەتوانرێ بڕێك بنووسرێت ژمارەی گشت پارچەکان بنوێنێ. هەرچەندە ژمارەیان لەهەر ڕیزێکدا زانراو نیە.

گریمان ی = ژمارەی پارچە دۆمینەکان لەهەر ڕیزێکدا.

| ٤ ڕیز | لێکدان | ژمارە لەهەر ڕیزێك |
|---|---|---|
| ↓ | ↓ | ↓ |
| ٤ | × | ی |

دەتوانرێ ٤ × ی بنووسرێت یا ٤( ی ) یا ٤ی



▲ (ڕالف لاو) ٥٢٩ پارچە دۆمینەی خستە سەریەك بۆ دروستکردنی تەنێك کە خاڵی ڕاگرەکە تەنها یەك پارچە دۆمینە بوو.

**لەبیرت نەچێ** بۆ دۆزینەوەی بەهای بڕ کە گۆڕاوێکی تێدابێت، گۆڕاوەکە بە ژمارەیەك بگۆڕەوە. پاشان کرداری ئەژمێرکردن جێبەجێبکە.

**نموونە ١** داستان لەهەر ڕیزێك ٦ پارچە دۆمینەی دانا ژمارەی هەموو پارچەکان چەندە؟ چی دەبێت ئەگەر لەهەر ڕیزێکدا ٩ پارچە هەبێت؟

**أ** ٤ × ی ئەژمێربکە کاتێك ی = ٦

٤ × ٦ ⟵ ٦ لە شوێنی ی دابنێ

↓

٢٤

ئەگەر ژمارەی پارچەکان لەهەر ڕیزێکدا ٦ بێت ئەوا ژمارەی گشتی پارچەکان دەبێتە ٢٤ پارچە.

**ب** ٤ × ی ئەژمێربکە کاتێك ی = ٩

٤ × ٩ ⟵ ٩ لە شوێنی ی دابنێ

↓

٣٦

ئەگەر ژمارەی پارچەکان لەهەر ڕیزێکدا ٩ بێت ئەوا ژمارەی گشتی پارچەکان دەبێتە ٣٦ پارچە.

**نموونە ٢** بڕێك بنووسە و پاشان بەهاکەی ئەژمێربکە.

**أ** شانیا دوو قەڵەمی دار و چەند پاکەتی لە قەلەمی ڕەنگاوڕەنگی کڕی. کە هەریەکەیان ٤ قەڵەمی تێدایە.

گریمان س = ژمارەی پاکەتەکان

ژمارەی قەڵەمە ڕەنگەکان کۆ دوو قەلەمی دار

٤ س + ٢

بڕەکە ٤ س + ٢

**ب** ئەگەر ٤ پاکەت قەڵەمی ڕەنگاوڕەنگ «بۆیە» و دوو قەڵەمی دارت کڕی ئەوا چەند قەلەمت کڕیووە؟

بەهای ٤ س + ٢ ئەژمێربکە، ئەگەر س = ٤

٤ × ٤ + ٢

١٦ + ٢

کەواتە، ژمارەی قەلەمەکان ١٨ قەلەمە.

ئەگەر شانیا ٣ پاکەت قەڵەمی بۆیە و دوو قەڵەمی دار بکڕێت، ئایا چەند قەڵەمی کڕیووە؟

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەوە چۆن بەهای بڕی (٨ × س) − ٥ ئەژمێردەکەی ئەگەر س = ٣

**بڕێك بنووسە ئەوەی هەر گۆڕاوێك دەینوێنێ ڕوونیبکەوە.**

**٢** شەونم ڕۆژی دووشەممە ماوەی دوو کیلۆمەتری بڕی و ئەمڕۆش ٣ کیلۆمەتر.

**٣** مریەم هەفتانە هەمان ژمارە کتێب دەخوێنێتەوە لەماوەی ٤ هەفتەدا.

**هەر بڕێك ئەژمێربکە کاتێك س = ١٠، و س = ١١، و س = ١٢**

**٤** ٤ س

**٥** (س + ٣) × ٤

**٦** ٢× س × ٥

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بڕێك بنووسە. ئەوەی گۆڕاوەکە دەینوێنێ دیاربکە.**

**٧** کارزان چەند کتێبێکی لایە. لەسەر هەر ڕەفەیەك ٧ کتێبی دانا.

**٨** هێمن ١٨ پارچە شیرینی لایە. هەمان ژمارە پارچە شیرینی دا بەهەر چوار هاوڕێکەی.

**خشتەکە تەواوبکە.**

**٩**

| س | ٢١× س |
|---|---|
| ٢ | |
| ٣ | |
| ٤ | |

**١٠**

| س | س+٢٨ |
|---|---|
| ١٢ | |
| ١٤ | |
| ٢٠ | |

**١١**

| س | ٩س−٦ |
|---|---|
| ٦ | |
| ٧ | |
| ٨ | |

**١٢**

| س | (س−١)×٢ |
|---|---|
| ٨ | |
| ١٠ | |
| ١١ | |

جەبر **گریمان ن = ٦. > یان < یان = لە شوێنی ● دابنێ.**

**١٣** ٤ × ن ■ ٤ + ن

**١٤** ٢ × ن ● ١٠ + ٦ + ن

**١٥** ٢٠ × ن ● ٥ × ٤ × ن

**١٦** **پرسیار چییە؟** پشتیوان بە ئۆتۆمبیلەکەی ن کیلۆمەتری لە کاتژمێرێکدا بڕی، بۆ ماوەی ٣ کاتژمێر وەڵام بریتیە لە ٣ × ن

**١٧** بەهای س چەندە کەوا لە بڕی ٧ × س دەکات یەکسان بێت بە ٤٩؟

**١٨** **بنووسە** ڕستەیەك بنووسە کە دەنوێنرێ بە بڕی (٤ × ن) + ٥، و ڕستەیەکی تریش کە دەنوێنرێ بە بڕی ٤ (ن + ٥) بنوێنێ.

**١٩** تەنێك پێکهاتووە لە ١ ٥٠٠ پارچە دۆمینۆ دوای کەوتنی پارچە دۆمینەکان یەك لەدوای یەك، ٥٧ پارچەی سور و دوو ئەوەندەی ئەویش لە پارچەی سەوز لە شوێنەکانی خۆیان مانەوە، چەند پارچە دۆمینە کەوتووە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٠** بەهای ڕەنووسی شین لە ٥٧ ٨٩٤ ٠٧٢ چەندە؟

**٢١** ٣,١ + ١,٨ + ٤,٤

**٢٢** ٦٦,٦٦٦ بە پیتی بنووسە.

**٢٣** ٤٥٦ ٠٣٩ + ٢٨ ٤٠٣

**٢٤** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — چ ژمارەیەك بۆ شوێنی ■ دەبێ؟

٣٠٨ ■ ٥٢ < ٥٢٤ ٨٠٣

أ ١، ٢، ٣، ٤، ٥

ب ٠، ١، ٢، ٣، ٤

ج ٣، ٤، ٥، ٦، ٧

د ٢، ٣، ٤، ٥، ٦

وانەی ٥

# سیفەتەکانی لێکدان

## Multiplication properties

### فێربە

تۆمارگەی سی دی شێرکۆ ٨ ڕەفەی هەیە لەسەر هەریەکەیان هەمان ژمارە پەپکەی دانا، هەڤاڵ ٥ ڕەفەی هەیە لەسەر هەر یەکەیان ٨ پەپکەی دانا، ژمارەی پەپکەکان لەلای هەریەکیان وەك یەکە ، شێرکۆ چەند پەپکەی لەسەر هەر ڕەفەیەك داناوە؟

دەتوانی هاوکێشەیەك بۆ نواندنی پرسیارەکە بنووسیت.

گریمان س = ژمارەی پەپکەکان لەسەر هەرڕەفەیەك لە ڕەفەکانی شێرکۆ

| پەپکەکانی شێرکۆ | | | | پەپکەکانی هەڤاڵ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ژمارەی ڕەفەکان | × | ژمارەی پەپکە لەسەر هەرڕەفەیەك | = | ژمارەی ڕەفەکان | × | ژمارەی پەپکە لەسەر هەرڕەفەیەك |
| ↓ | | ↓ | | ↓ | | ↓ |
| ٨ | × | س | = | ٥ | × | ٨ |

٨ ×س = ٥ × ٨ بیر لە سیفەتی ئالۆگۆڕ بکە

٨ × ٥ = ٥ × ٨ پێویستە کە س یەکسان بێت بە ٥

س = ٥

کەواتە، ٥ پەپکە لەسەر هەر ڕەفەیەك لە ڕەفەکانی شێرکۆ هەیە.

**نموونەکان** پرسیارەکە شیکاربکە.

أ (٨ × ٦) × ٥ = ٨ × (٦ ×س) سیفەتی پێکەوەبەستن

(٨ × ٦) × ٥ = ٨ × (٦ × ٥)

واتە، س = ٥

ب ١٦ × ت = ١٦ سیفەتی یەك « بێ لایەن»

١٦ × ١ = ١٦

واتە، ت = ١

• سیفەتی ئالۆگۆڕ بەچی لە سیفەتی پێکەوەبەستن جیادەکرێتەوە؟

**لەبیرت نەچێ** سیفەتەکانی لێکدان یارمەتی شیکاری پرسیارەکان بەهێزی دەدات.



### پێداچوونەوەی خێرا

١ ٧ × ٦= ■

٢ ٧٠ × ٦= ■

٣ ٧٠٠ × ٦= ■

٤ ٧٠٠٠ × ٦= ■

٥ ٧٠٠٠٠ × ٦ = ■

### زاراوەکان

سیفەتی ئالۆگۆڕ
commutative property

سیفەتی پێکەوەبەستن
associative property

### لە بیرتبێ

بۆ شیکاری پرسیارەکان دەکرێ ئەژمێرکردنی هزری و سیفەتەکانی لێکدان بەکاربهێنێ

سیفەتی ئالۆگۆڕ
٤×٣ = ٣×٤

سیفەتی پێکەوەبەستن
(٨×٢)×٦ = ٨×(٢×٦)

سیفەتی یەك «بێ لایەن»
٧ × ١ = ٧

سیفەتی سفر
٩ × ٠ = ٠

## ساغبکەوە

**١** ئەو سیفەتەی بە ئاسانی یارمەتی دیاریکردنی بەهای س دەدات باسبکە.

(١٦ × ٧٢) × س = ٠

**هاوکێشەکە شیکاربکە. سیفەتی بەکارهێنراو دیاری بکە**

**٢** (٧ ×د ) × ٨ = ٧ × (٣ × ٨) **٣** ن × ٣ = ٣ × ٩ **٤** م × ٧ = ٠

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هاوکێشەکە شیکاربکە. سیفەتی بەکارهێنراو دیاری بکە**

**٥** ٤ × (٨ × م) = (٤ × ٨) × ٧ **٦** ٩ × س = ٠ **٧** ن × ٤٣ = ٤٣ × ٣

**٨** (٦ × ٧) × ٢ = ٦ × ( س × ٢) **٩** ٥ × س = ٥ **١٠** ١ × ت = ١٦٥

**١١** ٥ × (ن × ١٣) = (٥ × ٤) × ١٣ **١٢** ١١٢ × ٩ = ن × ١١٢ **١٣** س × ١ = س

**جەبر** **سیفەتێك یان چەند سیفەتێك كە بەكارهاتووە دیاریبكە.**

**١٤** س × ی = ی× س **١٥** س × ٠ = ٠ **١٦** ن × ١ = ن

**١٧** س × (ب × ك) = (س × ب) × ك **١٨** (س × ب) × ك = ب × ( س × ك)

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** وێنە ڕوونکردنەوەییەکە بۆ شیکاری پرسیاری ١٩ و ٢٠ بەکاربێنە




**١٩** ژمارەی پەپکە فرۆشراوەکان لە ساڵی ١٩٩٧ تا ساڵی ١٩٩٩ بخەمڵێنە.

**٢٠** لەکام ساڵدا زۆرترین ژمارەی پەپکە فرۆشراوە؟

**٢١** شوێنی کەوانەکان دیاریبکە بەمەرجێك هاوکێشەکە ڕاست بێت.

٢٤×٣+٢٤×٧=٢٤٠

**٢٢** سۆزان لەماوەی ٢٠ چرکەدا لێدانی دڵی ژمارد. ژمارەی لێدانەکان ٢٩ ترپە «لێدان»بوو. ژمارەی لێدانی دڵی لەخولەکێکدا چەندە؟

**٢٣** کۆمەڵێك لەچێڵ و مراوی ژمارەی سەر و قاچیان ٩٩بوو. ئەگەر ژمارەی مراوییەکان دوو ئەوەندی چێڵەکان بێت. ئایا ژمارەی هەریەکەیان چەندە؟

**٢٤** **بنووسە** نموونەیەك بێنە بەدیاریبخات چۆن سیفەتی پێکەوەبەستن لە لێکداندا یارمەتیت دەدا لەشیکاری پرسیارەکان بەهزری؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

ژمارەی دەیی بەشێوەی کەرت بنووسە

**٢٥** ٠,٠٢١ **٢٦** ٠,٧٠٤

**٢٧** ژمارەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.

٣,٥٢؛ ٣,٢٥؛ ٢,٣٥

**٢٨** ٢٣ + ٤٧ + ١٩ + ١٠ + ١١

**٢٩** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە تەمەنی هوما بە ٦ ساڵ لە تەمەنی هەنیّ کەمترە. ئەگەر تەمەنی هەنیّ ١٩ ساڵ بێت بۆ دۆزینەوەی تەمەنی هوما کام هاوکێشە بەکاردێت؟

أ ٦ + ن = ١٩ ج ٦ + ١٩ = ن

ب ١٩ + ٦ = ن د ١٩ + ن = ٦

وانەی ٦

# بەشینەوە لە لێکدان

## Distribution in Multiplication



**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٢٩ + ٨
2. ٢٣٩ − ١٥
3. (٦ × ٢) × ٨
4. ٨٥٠٠ ÷ ١٠
5. ٩ × ٢٠ + (٩ × ٤)

**زاراوەکان**

**سیفەتی بەشینەوە**
**distribution property**

### فێربە

**پارچە پارچە** سیفەتی بەشینەوە لەلێکداندا بریتییەلە لێکدانی ژمارەیەك لەسەرجەمی دوو ژمارە، واتە لێکدانی ئەو ژمارەیە لەهەر یەك لە دوو ژمارەکە و پاشان ئەنجامی دوو لێکدانەکە کۆبکرێتەوە.

**چالاکی** بەدەست سیفەتی بەشینەوە بۆ ئەژمێرکردنی ٥ × ١٦ چۆن بەکاردەهێنرێ؟

**هەنگاوی ١**

لاکێشەیەك لەسەر کاغەزی چوارگۆشەکان دیاریکە، پانیەکەی ٥ یەکە و درێژیەکەی ١٦ یەکە بێت. بیر لە ڕووبەرەکە بکەوە وەك ئەنجامی لێکدان.




١٦ × ٥

**هەنگاوی ٢**

١٠ یەکە لەلای ڕاستی لاکێشەکە بژمێرە. هێڵێك بۆ بەشکردنی لاکیشەکە بکێشە.




(٦ + ١٠) × ٥

**هەنگاوی ٣**

سیفەتی بەشینەوە بۆ ڕونکردنەوەی سەرجەمی ئەنجامی لێکدان بەکار بهێنە یەکەمجار ناو کەوانەکان لێکبدە. پاشان ئەنجامی لێکدان کۆبکەرەوە




(٦ × ٥) + (١٠ × ٥)

٥٠ + ٣٠ = ٨٠

واتە ٥ × ١٦ = ٨٠

- کاغەزی چوارگۆشەیی بۆ ئەژمێرکردنی ٢٠ × ١٧ = ن بەکاربێنە.

دووبارە دەتوانی سیفەتی بەشینەوە بۆ دیاریکردنی بەهای بڕ لەگەڵ گۆڕاودا بەکاربهێنی.

**نموونە** بەهای ٦ × (ن + ٥) چەندە، ئەگەر ن = ١٠؟

| | |
|---|---|
| ٦ × (ن + ٥) = (٦ × ن) + (٦ × ٥) | سیفەتی بەشینەوە |
| = (٦ × ١٠) + (٦ × ٥) | لەشوێنی ن بەهای ١٠ دابنێن |
| = ٦٠ + ٣٠ | |
| = ٩٠ | |

- سیفەتی بەشینەوە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی هاوکێشەی ٧ × (ن + ٢) = ٨٤ بەکاربهێنە، ئەگەر ن = ٥، پاشان ن = ١٠.

## ساغبکەوە

**١** ڕوونبکەوە چۆن سیفەتی بەشینەوە بۆ دۆزینەوەی ٧ × ٨٢ بەکاردەهێنرێت. هەنگاوەکان دیاربکە.

**کاغەزی چوارگۆشەیی بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان.**

**٢** ١٨ × ١٠ **٣** ١٥ × ٢٠ **٤** ٦ × ٢٣ **٥** ١٤ × ٣٠

**سیفەتی بەشینەوە سەرلەنوێ بۆ نووسینی هەربڕێك بەکاربهێنە. پاشان ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.**

**٦** ٢٦ × ٧ **٧** ٢٤ × ٩ **٨** ٣ × ٢٦ **٩** ١٥ × ٧

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**کاغەزی چوارگۆشەیی بۆ ئەژمێرکردنی ئەنجامی لێکدان بەکاربهێنە.**

**١٠** ١٧ × ٥ **١١** ١٦ × ٩ **١٢** ١٤ × ٢٠ **١٣** ٦ × ٣٣

**سیفەتی بەشینەوە سەرلەنوێ بۆ نووسینی هەربڕێك بەکاربهێنە. پاشان ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.**

**١٤** ٨ × ١٤ **١٥** ٣٤ × ٨ **١٦** ٣٧ × ٩ **١٧** ٣٥ × ٦

**١٨** ٢٨ × ٩ **١٩** ٣٢ × ١٠ **٢٠** ٢٦ × ١٢ **٢١** ١٢ × ٥٠

**جەبر** دەقی بڕەکە سەرلەنوێ بەبەکارهێنانی سیفەتی بەشینەوە بنووسە. پاشان بەهای بڕەکە ئەژمێربکە

**٢٢** ٩ × (ن + ٨)کاتێك ن = ١٠ **٢٣** ٨ × (٤ + س)کاتێك س = ٢٠

**٢٤** ٣ × (٦ + ت)کاتێك ت = ٤٠ **٢٥** ٥ × (س + ٧)کاتێك س = ٨٠

**٢٦** پاشا ٤ شەتڵ تەماتەی هەیە و هەر شتڵەی هەفتانە ٤ دانە دەگرێت. پاشا بەرهەمی سێ هەفتەی لەگەڵ ٣ لە هاوڕێکانی بەشکرد. هەریەکەیان چەند تەماتەی بەرکەوتووە؟



**٢٧** **هەڵە لەکوێدایە؟** ئارام ٧ × (٣٠ + ٧) = ٢١٠ + ٧ = ٢١٧ی نووسی هەڵەکە دیاربکە و ڕاستی بکەوەو وەڵامە ڕاستەکە بنووسەوە.

**٢٨** سیفەتی بەشینەوە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی هاوکێشەکە بەکاربهێنە.
٥×(س+٦)=١٣٠، کاتێك س=٢٠.

**٢٩** **بنووسە** سیفەتی بەشینەوە بە بۆچوونی خۆت ڕاڤەبکە، نموونە لەسەر جێبەجێکردنیان بهێنەوە.

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٣٠** (١٧ − س) + ٢٧ ئەژمێربکە، کاتێك س = ٤.

**٣١** بۆ نزیکترین دەیەك نزیکبکەوە، پاشان کۆیبکەوە ٢,٤٦ + ٧,٣٩.

**٣٢** ٢,٥١ + ٠,٣٥

**٣٣** ٥٦,٩ − ٩٠,٨

**٣٤** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) بەهای ڕەنووسی ٨ لەژمارە ٢ ٨٠٥ ٧٠٤ بنووسە.

أ ٨٠٠ ج ٨٠ ٠٠٠

ب ٨ ٠٠٠ د ٨٠٠ ٠٠٠

وانەی ٧

# ڕێگاكانی شیكاری پرسیارەكان

## هاوكێشەیەك بنووسە

## Problem Solvin Strategies:

### Write an Equation



**پێداچوونەوەی خێرا**

بڕەكە ئەژمێریكە، كاتێك س = ١٢

١ ٢ + س

٢ ٦٤ − س

٣ س + ٣٦

٤ ١٤ − س

٥ س × ٧

**پرسیار** ڕووبەری ڕەشماڵێكی گەورە ٦٥ مەتر دووجایە، بارستاییەكەی ١٨ كگم. ڕەشماڵەكە لە ١٣ پارچە قوماشی ڕووبەر یەكسان پێكهاتووە. ڕووبەری هەر پارچەیەك چەندە؟

**لە بیرتبێ**

بڕەكان لەهەر دوولای هاوكێشەكە هەمیشە یەكسانن. نموونە

١٠ + ٥ = ١٥

↓ = ↓

١٥ = ١٥

**تێبگە**

- داواكراو چییە؟
- ئەو زانیاریانە چین كە بەكاریان دەهێنیت؟
- زانیاری هەیە كە بەكارت نەهێنابێت؟

**پلاندانی**

- چ ڕێگایەك بۆ شیكاری پرسیارەكە بەكاردەهێنیت؟

دەتوانی هاوكێشەیەك بنووسی و شیكاری بكەیت بۆ دۆزینەوەی ڕووبەری هەر پارچە قوماشێك.



**شیكاربكە**

چۆن ئەم ڕێگایە بەكاردەهێنیت بۆ شیكاری پرسیارەكە؟

هاوكێشە بنووسە. پاشان ئەژمێری هزری بۆشیكاری هاوكێشەكە بەكاربێنە؟ گریمان س = ڕووبەری هەر پارچە قوماشێك.

| ڕووبەری ڕەشماڵەكە | = | ژمارەی پارچە قوماشەكان | × | ڕووبەری هەرپارچەیەك |
|---|---|---|---|---|
| ↓ | | ↓ | | ↓ |
| ٦٥ | = | ١٣ | × | س |

س = ٥ **بیربكەوە:** ١٣ لێكدانی كام ژمارە یەكسانە بە ٦٥؟ كەواتە ڕووبەری هەر پارچە قوماشێك ٥ مەتر دووجایە.

**ساغبكەوە**

- چۆن لە ڕاستی وەلامەكەت دڵنیادەبیت؟
- چ ڕێگەیەكی تر دەتوانی بەكاربهێنی؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**هاوكێشە بۆ هەرپرسیارێك بنووسە وشیكاری بكە. ئەو گۆڕاوەی دەینوێنی ڕوونیبكەوە.**

١ ئەگەر ڕووبەری ڕەشماڵەکە ١٣٠م دووجا بێت، ڕووبەری هەرپارچە قوماشێك چەندە؟ وە ئەگەر ڕووبەر ١٤٣م دووجا بێت، دەبێتە چەند؟

٢ ١٨ ڕەشماڵ بەژمارەی یەكسان لەچەند ڕیزێكدا دانراون، ئەگەر ژمارەی گشتی ڕەشماڵەکان ٣ ئەوەندی ژمارەی هەرریزێك بێت ئایا لەهەرریزێكدا چەند ڕەشماڵ هەیە؟

**بەكارهێنانی پێدراوەكان** خشتەكە بۆ شیكاری پرسیاری ٣، ٤ بەكاربهێنە، ئەم خشتەیە ژمارەی ئەو پیتانە نیشاندەدات كە هەر قوتابییەك بەشێوەی دروست لە تاقیكردنەوەدا دەریبڕیوە.

| تاقیكردنەوە لەسەر دەربڕین | | | |
|---|---|---|---|
| ڕۆژان | بێژان | ژوان | ژیان |
| ١٩ | ١٨ | ١٥ | ١٦ |

٣ بێژان ٩٠ نمرەی لە تاقیكردنەوەكە هێنا. كام هاوكێشە بۆ دیاریكردنی ژمارەی نمرەكان لەسەر هەرخشتەیەك كە بەشێوەی دروست دەریبڕیو.

أ $١٨ \times$ س = ٩٠
ج ١٨ + س = ٩
ب ١٨ − س = ٩٠
د ٩٠− س = ١٨

٤ لە كام هاوكێشەدا س بەكارهێنراوە بۆنواندنی ژمارەی پیتەكان كە ڕۆژان بە شێوەیەكی دروست زیاتر لە ژوان دەریبڕیوە؟

أ س = ١٩ + ١٥
ج ١٥ = ١٩ + س
ب ١٥ + س = ١٩
د ١٩ = س − ١٥

## ڕێگاكانی شیكاری پرسیارەكان

- هێڵكاری یان وێنەیەك بكێشە
- نموونەیەك دروستبكە یان كردارێك جێبەجێبكە.
- لیستێكی ڕێكخراو پێكبێنە
- بەدوای شێوازێكدا بگەڕێ
- خشتەیەك یان وێنەیەكی ڕوونكردنەوە پێكبێنە
- بخەمڵێنە و ساغبكەوە
- بەهەنگاوەكانتا بچۆوە
- پرسیارێكی سادەتر شیكاربكە
- **هاوكێشەیەك بنووسە**
- دەرئەنجامی ژیربێژی بەكاربهێنە

## جێبەجێكردنە جیاوازەكان

٥ ئاریان كاتژمێر ١:١٥ی دوای نیوەڕۆ گەیشتە مەڵبەندی بازرگانی ، ٢٥ خولەكی لە دوكانی ئامێرە مۆسیقیەكان بەسەربرد، ٢٠ خولەكیش لە دوكانی جل و بەرگ و ٣٥ خولەكیش لە دوكانی كۆمپیوتەر. پاشان ڕۆیشت. ئاریان لە چ كاتێكدا لە مەڵبەندی بازرگانی ڕۆیشتە دەرەوە؟



٦ هەركاتێك ئۆتۆمبیلەكەی ئیبراهیم ١٢٠كم ببڕێت دەبەیەك سوتەمەنی پێویست دەبێت. ئەگەر بڕی سوتەمەنی لەناو تانكی ئۆتۆمبیلەكە ٣ دەبەبێت. ئایا بەشی بڕینی ماوەی ٤٠٠كم دەكات؟ وەڵامەكەت ڕوونبكەوە.

٧ **ڕێنوێنی** دوو ژمارە سەرجەمیان ٣٤ و جیاوازیان ٤، ئەو دوو ژمارەی كامانەن؟

٨ شاعیرێك ٢٣ نامەی لەلایەن خۆشەویستەكانیەوە لەڕۆژی دوو شەممە پێگەیشت هەروەها لە ڕۆژی سێشەممە ٥٤ نامە و ژمارەیەكی تریش لەڕۆژی هەینی پێگەیشت. ئەگەر ژمارەی گشتی نامەكان ١٢٧ نامە بێت. ئایا ڕۆژی هەینی چەند نامەی پێگەیشتبوو؟ هاوكێشەیەك بنووسە و شیكاری بكە. گۆڕاوەكە چی دەنوێنێ ڕوونیبكەوە.

٩ **پرسیار بنووسە** بتوانی بەهاوكێشەی س × ٣ = ٢١ شیكاری بكەی.

## بەشی ٣

# پێداچوونەوە
# Review

| | |
|---|---|
| هاوکێشە | equation |
| هێمای یەکسان | equal sign |
| بڕەکە | expression |
| گۆڕاو | variable |
| سیفەتی پێکەوەبەستن | associative property |
| سیفەتی بەشینەوە | distributive property |
| ئەژمێر بکەیت | calculate |

### دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

**دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.**

١ ___؟___ ڕستەیەکی ژمارەییە هێمای یەکسانی تێدا بەکاردەهێنرێ بۆ نیشاندانی دوو هێندەی یەکسان.

٢ ___؟___ پیت یان هێمایەکە ژمارەیەك دەنوێنێ.

٣ ___؟___ لێکدانی ژمارەیەك لەسەرجەمێك وەك ئەوە وایە کە هەر کۆلکەیەك لەسەرجەم لێکدانی ئەو ژمارەیە بدرێت پاشان ئەنجامی لێکدان کۆبکرێتەوە.

٤ بۆ ئەوەی بەهای بڕەکە ___؟___ گۆڕاوەکە بە ژمارەیەك دەگۆڕدرێت پاشان کردارەکان جێبەجێ دەکرێت.

### دڵنیابوون لە کارامەییەکان

**بڕێك بنووسە ئەوەی هەرگۆڕاوێك دەینوێنێ ڕوونیبکەوە.**

٥ لە قوتابخانەیەکدا ١٦ بژمێر هەیە لەساڵی داهاتوو چەند دانەیەکی تری بۆ زیاددەکرێ.

٦ لەشەمەندەفەرێك ٥٣ نەفەر هەیە. هەندێکیان دابەزین.

**بەهای بڕەکە ئەژمێربکە.**

٧ $(٩٠ - ك) \times ٢$ کاتێك ك $= ٤٥$

٨ س $\times ١٠ \times ٤$ کاتێك س $= ٣$

٩ $(٠ \times ت) \times ٥$ کاتێك ت $= ٧$

١٠ $١٢ \times (٦ + ٤) + ٨$

١١ $٣٦ \div (٩ + ٣) - ٣$

١٢ $(٥ \times ٨) \div (٨ - ٦)$

**هاوکێشەیەك بنووسە، ئەوەی گۆڕاوەکە دەینوێنێ ڕوونبکەوە. پاشان هاوکێشەکە شیکاربکە.**

١٣ شاد ١٧ قەڵەمی هەیە، چەند دانەیەکی دابە دیار، ٩ دانەی لا مایەوە. چەند قەلەمی داوەتێ؟

١٤ عادل ١٧ پەیکەی هەبوو، چەند دانەیەکی تری کڕی. ژمارەکەی بوو بە ١٨ پەیکە عادل چەند پەیکەی کڕیوە؟

**هاوکێشە شیکاربکە. ئەو سیفەتەی بەکارتهێناوە دیاریبکە.**

١٥ $٠ = ١٩ \times$ س

١٦ $(٥ \times ٤) \times ٩ = ٥ \times ($س $\times ٩)$

١٧ $١٦ = $ ت $\times ١٦$

١٨ $٦ \times$ س $= ١٣ \times ٦$

### دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

**شیکاربکە.**

١٩ لازۆ ویستی باخچە لاکێشەکەی بەتەل پەرژین بکات کە درێژییەکەی ١٨م و پانیەکەی ١٢م . پێویستی بە چەند مەتر تەل هەیە؟

**هاوکێشەیەك بنووسە و شیکاری بکە**

٢٠ شازاد ویستی ٢٤ کتێب بەیەکسانی لەناو ٤ پاکەتدا دابنێ چەند کتێبی خستۆتە ناو هەر پاکەتێك؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep




**پرسیارەکە تێبگە**

هاوکێشەی پرسیاری ٤ ئەوە دەگەیەنێ کە س − ٥ یەکسانە بە ٧ + ١٢ یان ١٩ لەبەرئەوەی ٥ لە س دەرکراوە، پێویستمان بەدیارکردنی ژمارەیەك هەیە کە ٥ی لە ١٩ زیاتربێت.

**وەڵامی گونجاو بۆ پرسیاری ١ تا ٨ هەڵبژێرە.**

**١** کام ڕستە هاوکێشەی ١٠ − س = ٦ دەنوێنێ؟

أ ژمارەیەك ١٠ی کەمبێت یەکسانەبە ٦

ب ١٠ کەم ٦ یەکسانەبە ژمارەیەك

ج ١٠ کەم ژمارەیەك یەکسانەبە ٦

د ٦ کەم ژمارەیەك یەکسانەبە ١٠

**٢** کام بڕ سیفەتی ئاڵوگۆڕ لەکۆکردنەوەدا دەنوێنێ؟

أ ١٦ + ٧ = ١٦ + ٧ + ٠

ب ١٦ + ٧ = ٧ + ١٦

ج ١٦ + ٠ = ١٦

د (١٦ + ٧ ) + ٢ = ١٦ + (٧ + ٢)

**٣** کام ژمارە هاوتا نیە لەگەڵ ٧٥،١؟

أ ٧٥،١٠ ج ٦٥،١ + ١٠،٠

ب ٧٦،٠ − ٠،٩ د ٧٥،٠ + ٠،٠١

**٤** بەهای س لە س − ٥ = ٧ + ١٢ کامەیە؟

أ ٢٤ ب ١٩ ج ١٤ د جگە لەوان

**٥** بەهای ١٠ × س × ٣ چەندە، ئەگەر س = ٢؟

أ ٢٣ ب ٣٠ ج ٣٦ د جگە لەوان

**خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیاری ٦ تا ٨.**




**٦** کام گیانەوەر خێراییەکەی نزیکەی دووئەوەندی خێرایی ووشترە؟

أ کەنغەر ج بەور (پڵنگ)

ب کەری کێوی د جگە لەوان

**٧** ئەگەر کەنغەر ٦ خولەك ڕابکات، دەبێ ووشتر چەند ڕابکات بۆ ئەوەی هەمان ماوە ببڕێت؟

أ ٦ خولەك ج ٨ خولەك

ب ٧،٥ خولەك د ١٢ خولەك

**٨** کام هاوکێشە ئەو ماوەیە بەمەتر دیاریدەکات کە بەورەکە لەماوەی ١٤ خولەکدا بڕیویەتی؟

أ ١٤ × ٩٠٠ = ١٢ ٦٠٠ ج ١٤ + ٩٠٠ = ٩١٤

ب ١٤ × ٤ = ٩٠٠ د ١٤ × ٨٥٠ = ١١ ٩٠٠

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know



**٩** بارێك باسبکە بتوانی بە هاوکێشەی ١٠ − س = ٦ بینوێنی. پاشان هاوکێشەکە شیکار بکە.

**١٠** بۆئەم پرسیارەی دێت هاوکێشەیەك بنووسە و شیکاری بکە. پاشان نواندنی گۆڕاوەکە ڕوونبکەوە. شاباز ١٠٨ هەزار دینار لەبڕی نرخی ٩ فەرهەنگ داوە، نرخی یەك فەرهەنگ چەندە؟

بەشی ٤

# چارەسەرکردنی پێدراوەکان

## Data Processing

زریان گەردەلوولێکی گەورەیە، ڕەشەبای لەگەڵدایە کە خێراییەکەی دەگاتە ١٢٠کم/کاتژمێر یان زیاتر. زریانی فلۆریدا لە ساڵی ١٩٩٩ هەڵیکردە سەر کارۆلینای باکور و باهاما، بووە هۆی زیان و پەکخستنێکی زۆر. هێلکاری ڕوونکردنەوەی خوارەوە خێرایی ڕەشەبای زریانی فلۆریدا لەماوەی هەڵکردنی لەسەر کارۆلینای باکور دەنوێنێ.

**پرسیار بۆ شیکار** لەکام ماوە لە دوو ڕۆژدا خێرایی ڕەشەباکە زۆرتربووە؟

خێرایی ڕەشەبای زریانی فلۆریدا



# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

ئەستوونەکانی ڕوونکردنەوەیی
barcharts
هێڵی ڕوونکردنەوەیی
graphical line
وێنەکراوەکان diagram

١ ئەگەر چەند پێدراوێکی جیاوازت هەبوو، بە ئاسانی دەتوانی ئەو پێدراوانەبە بەکارهێنانی ___؟___ بەراوردبکەیت.

٢ وێنەی ڕوونکردنەوەیی کە گۆڕانی پێدراوەکانی تێدا دەردەکەوێت بەپێی کات بریتییە لە ___؟___ .

## خشتە دووبارەبووەکان

خشتە دووبارەبووەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٣ تا ٦ بەکاربهێنە.

نمرەی تاقیکردنەوەکان

| نمرەی | دووبارە |
|---|---|
| ٧٠ | ١٢ |
| ٨٠ | ١٥ |
| ٩٠ | ١٧ |
| ١٠٠ | ١٢ |

٣ لە تاقیکردنەوەکەدا چەند قوتابی نمرەی ٩٠ی بەدەست هێنا؟

٤ چەند قوتابی نمرەی ٩٠ یان ١٠٠ی بەدەست هێنا؟

٥ چەند قوتابی لەتاقیکردنەوەکەدا بەشداربوو؟

٦ چەند قوتابی کەمتر لە ٩٠ نمرەیان بەدەست هێنا؟

## خوێندنەوەی وێنەی ڕوونکردنەوەیی




ئەستوونی ڕوونکردنەوەیی بۆ شیکاری پرسیاری ٧ تا ١٢ بەکاربهێنە.

٧ چەند جۆر پێداویستی لەم وێنە ڕوونکردنەوەییە دەردەکەوێت؟

٨ چەند قەڵەم لە گەنجینەکەدا هەیە؟

٩ سەرجەمی ژمارەی کەرەستەکان لە کۆگای چەندە؟

١٠ ژمارەی ئامێرە ئەندازەییەکان چەندی لەژمارەی ڕاستەکان زیاترە؟

١١ کام کەرەستە لە کۆگاکەدا زۆرترین ژمارەی هەیە؟

١٢ ئەگەر نرخی قەڵەمێك ٢٠٠٠ دینار بێت. نرخی هەمووی چەندە؟

## جووتە ڕێکخراوەکان




بۆ ناولێنانی خاڵەکانی سەر تۆڕی چوارگۆشەکان لە پرسیارەکانی ١٣ تا ٢٢ جووتە ڕێکخراوەکان بەکاربهێنە.

١٣ (١؛ ٣)

١٤ (٢؛ ٦)

١٥ (٥؛ ٤)

١٦ (٤؛ ١)

١٧ (٦؛ ٨)

١٨ (٠؛ ٥)

١٩ (٧؛ ٥)

٢٠ (٢؛ ٩)

٢١ (٩؛ ١٠)

٢٢ (٨؛ ٠)



وانەی
١

# کۆکردنەوە و ڕێکخستنی زانیارییەکان

## Collecting and organising Data

### پێداچوونەوەی خێرا

١ ٢٤ + ٩

٢ ٢٤ + ١٣

٣ ١٨ + ٤٠

٤ ٢٢٠ + ١٥

٥ ١٦٠ + ٢٤٠

### زاراوەکان

**دووبارەبوونەوەی کەڵەکەبوو**

**cumulative ferquency**

### فێربـــــە

خشتەی سەرژمێری خوارەوە ژمارەی فایلە فرۆشراوەکان لە پێنج هەفتەی یەکەم لەساڵی خوێندندا دەنوێنێ. چۆن دەتوانی ژمارەی گشتی فایلە فرۆشراوەکان بدۆزیتەوە؟ دەتوانی خشتەیەکی دووبارەبوونەوە بۆ ڕێکخستنی پێدراوە نیشاندراوەکان لەخشتەی سەرژمێری پێکبێنی.

پەیوەست

### چالاکی

ئەم خشتەی سەرژمێریە کۆپیبکە

**هەنگاوی ١**

هێمای سەرژمێری هەر هەفتەیەك بژمێرە. ئەم سەرجەمە لەئەستوونی دووبارەبوونەوە لە خشتەی دووبارەبوونەوەی بەرامبەر بنوسە

فایلە فرۆشراوەکان

| هەفتەکان | ژمارەی فایلەکان |
|---|---|
| هەفتەی ١ | 卌 卌 卌 卌 |
| هەفتەی ٢ | 卌 卌 卌 |
| هەفتەی ٣ | 卌 卌 \|\|\|\| |
| هەفتەی ٤ | 卌 卌 \|\| |
| هەفتەی ٥ | 卌 卌 \| |

**هەنگاوی ٢**

ئەم **دووبارەبوونەوەی کەڵەکەبوو** سەرجەمی فایلە فرۆشراوەکان دەنوێنێ

فایلە فرۆشراوەکان

| هەفتەکان | دووبارە بوونەوەی فایلە فرۆشراوەکان | دووبارە بوونەوەی کەڵەکە بوو |
|---|---|---|
| هەفتەی ١ | ٢٠ | ٢٠ |
| هەفتەی ٢ | ١٥ | ٢٠ + ١٥ = ٣٥ |
| هەفتەی ٣ | | |
| هەفتەی ٤ | | |
| هەفتەی ٥ | | |

ڕەنووسی کۆتایی لە ئەستوونی دووبارەبوونەوەی کەڵەکەبوو ژمارەی گشتی فایلە فرۆشراوەکان دیاریدەکات

کەواتە، ژمارەی فایلە فرۆشراوەکان ٧٢



- ژمارەی فایلە فرۆشراوەکان تا کۆتایی هەفتەی سێیەم چەندە؟

## ساغبکەوە

١ خشتەی دووبارەبونەوە و خشتەی سەرژمێری بەچی لێك جیادەکرێنەوە و لەچیدا جیاوازن.

**خشتەی دووبارەبوونەوە بۆ شیکاری پرسیاری ٢ تا ٥ بەکاربهێنە.**

| دەفتەرەکان کە قوتابیان کریان | | |
|---|---|---|
| ژمارەی دەفتەر لەبەستەیەکدا | دووبارەبوونەوەی ژمارەی قوتابیان | دووبارەبوونەوەی کەڵەکەبوو |
| ١ | ٣١ | ٣١ |
| ٢ | ٢٢ | ٥٣ |
| ٣ | ١٦ | ٦٩ |
| ٤ | ١٥ | ٨٤ |
| ٥ | ١٢ | ٩٦ |

٢ کام بەستە زۆرترین قوتابی کڕیویانە؟

٣ کام بەستە کەمترین قوتابی کڕیویانە؟

٤ ژمارەی ئەو قوتابیانەی کەمتر لە ٤ بەستە دەفتەریان کڕیوە چەندە؟

٥ ژمارەی ئەو قوتابیانەی کە دەفتەریان کڕیوە چەندە؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**خشتەی دووبارەبوونەوە، بۆ شیکاری پرسیاری ٦ تا ٩ بەکاربهێنە.**

| بەشداربوو لە یانە | | |
|---|---|---|
| هەفتەکان | دووبارە بوونەوە | دووبارەبونەوەی کەڵەکەبوو |
| هەفتەی ١ | ٧ | ٧ |
| هەفتەی ٢ | ١٣ | ٢٠ |
| هەفتەی ٣ | ٥ | ٢٥ |
| هەفتەی ٤ | ١٤ | ٣٩ |

٦ چەند قوتابی لەهەفتەی یەکەم و هەفتەی سێیەم بەشداربوون؟

٧ چەند قوتابی تاکۆتایی هەفتەی دووەم بەشداربوون؟

٨ لەچوار هەفتەکەدا چەند قوتابی بەشداربوون؟

٩ ژمارەی بەشداربوو لە هەفتەی یەکەم و دووەم چەندی زیاتربوو لەژمارەی بەشداربوو لە هەفتەی سێیەم و چوارەم؟

**خشتەی سەرژمێری بۆ شیکاری پرسیاری ١٠ تا ١٣ بەکاربهێنە.**

| بەشداربوون لەچالاکیە وەرزشیەکان | |
|---|---|
| کاتی چالاکی | ژمارەی قوتابیان |
| ٩:٣٠ پێش .ن | ~~||||~~ ~~||||~~ ~~||||~~ | |
| ١٠:٣٠ پێش .ن | ~~||||~~ ~~||||~~ ||| |
| ١:٣٠ پاش .ن | ~~||||~~ ~~||||~~ ~~||||~~ || |
| ٢:٣٠ پاش .ن | ~~||||~~ ~~||||~~ ~~||||~~ ||| |

١٠ خشتەی دووبارەبوونەوە بۆ پێدراوەکان دروستبکە.

١١ زۆرترین قوتابی کام کاتیان هەڵبژاردووە؟

١٢ چەند قوتابی هاوبەشیان لەچالاکییەکانی پێش نیوەڕۆدا کردوە؟

١٣ ئەگەر هەرقوتابیەك تەنها لەیەك چالاکیدا بەشداری کردبێت، ژمارەی ئەو قوتابیانەی لەچالاکی وەرزشی هاوبەشیانکردووە چەندە؟

١٤ **پرسیار چییە؟** لە ڕاپرسێك لەسەر ڕەنگە پەسندکراوەکان، ١١ قوتابی ڕەنگی شین و ٧ قوتابی ڕەنگی سوریان هەڵبژارد. ئەوانەی مانەوە سەوزیان هەڵبژارد. ٢٤ قوتابی تێیدا بەشداربوو. وەڵام ٦.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١٥ بڕێك بنووسە ئەم ڕووداوەی دێت بنوێنێ:
کوێستان ٤ لاپەڕەی کەمتر لە بوستان خوێندەوە، بوستان س لاپەڕەی خوێندەوە.

١٦ شیکاربکە. ن − ٩ = ٢١

١٧ نزیکبکەوە. ٢ ٤٩٧ ٦٢٩ بۆ نزیکترین ملیۆن.

١٨ ٦,٠٥٨ بۆ نزیکترین دەیەك نزیکبکەوە.

**ئەو پیتە هەڵبژێرە کە نووسینی ژمارەکە بە ڕەنووس ڕووندەکاتەوە.**

١٩ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) پێنج و نۆ دەیەکی.

أ ٥,٠٩ ج ٩,٥
ب ٥,٩ د ٥٠٩

٢٠ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) بیست و شەشە بەش لەسەد.

أ ٠,٠٢٦ ج ١,٢٦
ب ٠,٢٦ د ٢,٦

وانەی ٢

# ناوەند

## Mean

### فێربە

### پێداچوونەوەی خێرا

١ ‏٩٠ ÷ ٣

٢ ‏١٨٠ ÷ ٣ ‏ ٣ ‏٥٦ ÷ ٨

٤ ‏٧٥ ÷ ٣ ‏ ٥ ‏٨٨ ÷ ٤

### زاراوەکان

**ناوەند** mean

ساڵانە قوتابخانەیەك پێشبڕکێ بۆ قوتابیان ڕێکدەخات بۆ باسکردنی زاراوەکان. قوتابیە بەشداربووەکانی پۆلی پێنجەم لە پێشبڕکێکەدا ئەو ئەنجامانەیان تۆمارکرد کە لەخشتەی بەرامبەردا هاتووە. ناوەندە ئەنجامەکانیان چەندە؟

| پێشبڕکێی باسکردنی زاراوەکان | |
|---|---|
| ناو | ژمارەی زاراوە ڕاستەکان |
| دارۆ | ٥٨ |
| داریا | ٥٨ |
| دلێر | ٥١ |
| دۆستی | ٦٢ |
| دارا | ٦١ |

**ناوەند** (تێکڕا) ژمارەیەکە پێدراوەکان دەنوێنێ، دەتوانی ناوەند دیاریکەین بەکۆکردنەوەی گشت پێدراوەکان. پاشان سەرجەم دابەشی ژمارە پێدراوەکان بکەیت.

### نموونەکان

**هەنگاوی ١** هەموو پێدراوەکان کۆبکەوە

٥٨ + ٥٨ + ٥١ + ٦٢ + ٦١ = ٢٩٠

**هەنگاوی ٢** سەرجەم دابەشی ژمارەی پێدراوەکان بکە.

٢٩٠ ÷ ٥ = ٥٨ (٢٩٠ − ٢٥ = ٤٠، ٤٠ − ٤٠ = ٠)

کەواتە، ناوەند ٥٨.

● ئەگەر دانا ٧٠ زاراوەی ڕاست بێت و بۆ خشتەکە زیادبکەی، چ کاریگەرییەکی لەسەر ناوەند دەبێت؟

### نموونەکان

ناوەند بۆ هەر کۆمەڵەیەك لە پێدراوەکان دیاریبکە.

أ ‏٧٤؛ ٩١؛ ٦٣؛ ٩٢؛ ٨٥

٧٤ + ٩١ + ٦٣ + ٩٢ + ٨٥ = ٤٠٥

٤٠٥ ÷ ٥ = ٨١ (٤٠٥ − ٤٠ = ٠٥، ٥ − ٥ = ٠) ← ژمارەی پێدراوەکان

ب ‏٣٥٧؛ ٥٦٢؛ ٤١١؛ ٥٨٤؛ ٢٩٤؛ ٣٧٢

٣٥٧ + ٥٦٢ + ٤١١ + ٥٨٤ + ٢٩٤ + ٣٧٢ = ٢٥٨٠

٢٥٨٠ ÷ ٦ = ٤٣٠ (٢٥٨ − ٢٤ = ١٨، ١٨ − ١٨ = ٠٠، ٠ − ٠ = ٠) ← ژمارەی پێدراوەکان

هەروەها بۆ ئەژمێرکردنی ناوەند دەتوانی ئامێری بژمێر بەکاربهێنی.

( ٣٥٧ + ٥٦٢ + ٤١١ + ٥٨٤ + ٢٩٤ + ٣٧٢ ) ÷ ٦ = ٤٣٠

## ◄ ساغبکەوە

١ ئەم کۆمەڵە پێدراوانە بخوێنەرەوە. ٥؛ ١٦؛ ١٧؛ ١٧؛ ١٧؛ ١٧؛ ١٨، ئایا گومان دەکەیت کە ناوەند نزیکتربێت لە ٥ یان لە ١٦؟ ئەمە لێکبدەرەوە.

**ناوەندی هەر کۆمەڵێك لەم پێدراوانە دیاریبکە.**

٢ ١٨؛ ٢٢؛ ١٤    ٣ ٥٨؛ ١٠٥؛ ١٧٢؛ ٤٥    ٤ ٣٣؛ ٣٦؛ ٣٥؛ ٣٧؛ ٣٩

## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ناوەندی هەر کۆمەڵەیەك لەم پێدراوانە دیاریبکە.**

٥ ٩؛ ٦؛ ٥؛ ٩؛ ١١    ٦ ٦؛ ٧؛ ٩؛ ١٠    ٧ ١٩؛ ٢٥؛ ٢٨؛ ٣٢

٨ ١ ٢٥٠؛ ٩٨٠؛ ٣٥٠    ٩ ١١٠؛ ٧٥؛ ١٣٥؛ ١٦٠    ١٠ ١٤٧؛ ١١٦؛ ١٤٨؛ ١٢٨؛ ١١٦

١١ ٩٥؛ ٨٤؛ ٧٢؛ ٧٣؛ ٧٦    ١٢ ١٢٤؛ ١٣٠؛ ١٠٠؛ ١٢٢؛ ١٢٤    ١٣ ٢٠٢؛ ٢١٣؛ ٣١٥؛ ٢٨٥؛ ٢٨٥

١٤ ١٠٠؛ ١٥٠؛ ٢٠٠؛ ١٧٠؛ ٢٥٠؛ ٣٠٠    ١٥ ١ ٢٠٠؛ ٢ ٤٠٠؛ ١ ٣٢٠؛ ٢ ٥٦٠

**ناوەندەی دراو بۆ دیاریکردنی ژمارەی نادیار لەهەر کۆمەڵەیەك لە پێدراوەکان بەکاربهێنە.**

١٦ ١؛ ٣؛ ٥؛ ■ ناوەند: ٤    ١٧ ٥؛ ٧؛ ١٠؛ ١٣؛ ■ ناوەند: ١٠

١٨ ١٢؛ ١٥؛ ١٨؛ ١٠؛ ■ ناوەند:١٣    ١٩ ٢٠؛ ٢٥؛ ٣٠؛ ■؛ ٣٢؛ ١٨ ناوەند: ٢٥

**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ٢٠تا ٢٤ بەکاربهێنە.**

تۆماری نمرەکان

| ناو | تاقیکردنەوە ١ | تاقیکردنەوە ٢ | تاقیکردنەوە ٣ | تاقیکردنەوە ٤ |
|---|---|---|---|---|
| کاردۆ | ٨٧ | ٩٣ | ١٠٠ | ٨١ |
| کاروان | ٩٥ | ٩٢ | ٨٩ | ٧٦ |
| کارزان | ٨١ | ٨٦ | ٨٢ | نەهاتوو |
| کاربین | ٨٥ | ٨٥ | ٨٥ | ٨٥ |

٢٠ تێکڕایی نمرەکانی کاروان چەندە؟

٢١ چۆن تێکڕایی نمرەکانی کاربین بەبێ ئەژمێرکردن دەدۆزیتەوە؟

٢٢ کامیان بەرزترین ناوەند یان تێکڕای نمرەکانی بە دەستهێناوە، کاردۆ یان کاروان یان کاربین؟

٢٣ **دەرئەنجام** کارزان پێویستی بەچەند نمرە هەیە لە تاقیکردنەوەی ٤دا تاکو تێکڕای نمرەکان بکاتە ٨٥؟

٢٤ **بنووسە** پرسیارێك بنووسە بە بەکارهێنانی پێدراوەکانی خشتەکە پاشان پرسیارەکە شیکاربکە

٢٥ هەموویان لە ڕیزێکدا دانیشتبوون کاردۆ لەپێش کارزان و لەدوای کاربینەوە بوو کاروان یەکەمی ڕیزەکە بوو. کێ ڕاستەوخۆ لەدوای کارزان دانیشبوو؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

٢٦ بەهای ٥ + م چەندە؟ کاتێك م = ١٢.

٢٧ ٨٥ ٩٤١ + ٥ ٣٥٧

٢٨ ٣ ١٠٠ ٥٦٨ − ١ ٣٨٧ ٥٥٥

٢٩ ٣٢,٥ ٨٧٦ بۆ نزیکترین بەش لەهەزار نزیکبکەوە.

٣٠ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە شیکاری هاوکێشەی ١٣ + ن = ٢٩ کامەیە؟

أ ن = ١٣    ج ن = ٢٩

ب ن = ١٦    د ن = ٤٢

وانەی ٣

# شیکردنەوەی ڕوونکردنەوەییەکان

## Analyze Data

### فێربە

ئەم **وێنەدارە** ژمارەیەك پێدراو بەهۆی کۆمەڵێك هێما و وێنەوە دەخاتەڕوو بۆهەر وێنەدارێك کلیلێك هەیە، ئەویش ئەو ژمارەیە ڕوون دەکاتەوە کە هێماکە دەینوێنێ.

**ژمارەی قوتابیان لە وانەی وەرزش**

| | |
|---|---|
| ٣:٠٠ | X X X |
| ٤:٠٠ | X X X X X ½ |
| ٥:٠٠ | X X X X X X ½ |

کلیلی X = دوو قوتابی

بڕوانە وێنەداری ژمارەی قوتابیان لەوانەی وەرزشدا ژمارەی گشتی قوتابیان کە لە هەردوو دوو وانەی کاتژمێری ٣،٠٠ و ٤،٠٠ بەشداربوون چەندە؟

لە ڕیزی دوو وانەکەدا ٨ هێما ونیو هەیە.

واتە، (٨ × ٢) + ١ = ١٧

**ئەستوونە ڕوونکردنەوەییەکان** پێدراوە ژماردراوەکان بەهۆی ئەستوونی ئاسۆیی و شاوڵی دەخاتەڕوو. ئەم جۆرە وێنە ڕوونکردنەوەییە یارمەتی بەراوردکردنی ڕاستیەکانی پەیوەند بە کۆمەڵێك لە پێدراوەکان دەدات.




ئەستونە ڕوونکردنەوەییەکانی لای چەپ بخوێنەوە.

کام گیانەوەر لە ڕاکردندا خێراترە، شێر یان کەروێشك؟

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە سەرنج لە ئەستوونی شێرەکە بدە.

خێرایی شێر چەندی لە خێرایی کەروێشك زیاترە؟

خێرایی شێر ٥٠ کم/ك و خێرایی کەروێشك ٣٥ کم/ك

٥٠ – ٣٥ = ١٥ کەواتە، خێرایی شێر ١٥ کم/ك لە خێرایی کەروێشك زیاترە.

**هێڵی ڕوونکردنەوەیی** چۆنێتی گۆڕانی پێدراوەکان بەپێی کات ڕوون دەکاتەوە. تەماشای هێڵی ڕوونکردنەوەیی بۆ ناوەندە ماوەی ڕاهێنانە وەرزشییەکانی دلێر بکە. ماوەی ڕاهێنانە وەرزشییەکان کە چاوەڕوان دەکرێ دلێر لە هەفتەی حەوتەمدا چەندە جێبەجێی بکا؟ دلێر ماوەی ڕاهێنانە وەرزشییەکەی هەرهەفتەیەك ٥ خولەك درێژدەکاتەوە. لەبەر ئەوەی ناوەندە ماوەی ڕاهێنانی لە هەفتەی شەشەم ٤٥ خولەك بوو، ناوەندە ڕاهێنانی لە هەفتەی حەوتەمدا دەبێتە ٥٠ خولەك.




**مەودا** بریتییە لە جیاوازی نێوان گەورەترین و بچووکترین ژمارە لە پێدراوەکان.

### پێداچوونەوەی خێرا

ژمارەی نادیار لەشێوازەکەدا کامەیە؟

١ ١٦، ١٧، ١٨، ▢

٢ ٠، ٢، ٤، ٦، ▢

٣ ٧، ١٠، ١٣، ▢

٤ ٤، ٨، ١٢، ١٦، ▢

٥ ٨٠، ٨٤، ٨٨، ▢

### زاراوەکان

وێنەدار diagram

ئەستونە ڕونکردنەوەییەکان barchart

هێڵی ڕوونکردنەوەیی graphical line

مەودا range

## ساغبکەوە

**١** کام جۆر لە وێنە ڕوونکردنەوەییەکان باشترە بۆ بەراوردکردنی تێکڕای پلەکانی گەرما لە هەفتەیەکدا؟ وبۆچی؟

**وێنەی ڕوونکردنەوەی پێشوو بۆ شیکاری پرسیاری ٢، ٣ بەکاربهێنە.**

**٢** ناوەندەی کاتی ڕاهێنانە وەرزشیەکانی دلێر چەندە؟ مەودای دەگاتە چەند؟

**٣** لەکام هەفتەدا پێشبینی دەکەیت کە ناوەندە ماوەی ڕاهێنانی دلێر ١ کاتژمێر بێت؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**پیشە و ڕۆیشتن بە پێ**

| پیشە | |
|---|---|
| پیشەی پۆلیس | ٨ |
| پیشەی نامەبەر | ٦½ |
| پیشەی ڕۆژنامەنوس | ٥ |
| پیشەی پزیشك | ٤ |

کردنەوەی: 👣 = ٢٠٠ کم لە ساڵێکدا

**وێنەدارەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٤ تا ٧ بەکاربهێنە.**

**٤** کام پیشە پێویستی بەپێ ڕۆیشتنی زیاتر هەیە؟

**٥** کام دوو پیشە ناوەندەی ڕۆیشتن بەپێ تیایاندا نزیکەی هەمان ڕۆشتنە؟

**٦** هەر هێمای شوێن پێیەك چی دەنوێنێ؟

**٧** پزیشك ساڵانە نزیکەی چەند کم دەبڕێت؟

**کەمبوونەوەی بارستایی سازان**



**ئەم هێڵی ڕوونکردنەوەیە بۆشیکاری پرسیاری ٨تا ١١ بەکاربێنە**

**٨** سازان خشتەیەکی بۆ خواردەمەنی ڕێکخست تابارستاییەکەی کەم بکاتەوە. لەکام هەفتەدا بارستایی سازان بەشێوەیەکی زۆر کەمدەکات؟

**٩** سازان لەنێوان هەفتەی یەکەم و سێیەمدا چەند بارستایی دابەزی؟

**١٠** ئەگەر سازان دوای هەفتەی چوارەم هیچ لە بارستایی دانەبەزی. هێڵی ڕوونکردنەوەیی لەنێوان هەفتەی چوار و پێنج چۆن دەبێت؟

**١١** مەودای کەمکردنەوەی بارستایی سازان چەندە؟

**١٢** عەلی لەکێڵگەیەکدا کاردەکا، هەرڕۆژێك ٠.٢ کگم دانەوێڵە دەدات بە مریشکێك، چەند کگم دانەوێڵەی پێویستە بۆ ٥ مریشك لەدووهەفتەدا؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**١٣** ١ ٣٦٩ ٥٠١ + ٣ ٦٩٥ ٢٢٤

**١٤** ٨٢ ٩٥٤ − ٦٠ ٣٨٧

**١٨** ١٢,٧٩٤٥ − ١,٦٨

**١٩** ٠,٦٩ + ١,٥٧٧

**١٥** ١١ + س = ٥٧

**١٦** س − ١٦ = ٣٨

**٢٠** ٤٢ − س = ٢٨

**٢١** ن + ٨ = ٢٥

**١٧** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ناوەندە، ئەم ژمارانە ئەژمێربکە:
٢٦؛ ٣٥؛ ٨٧؛ ١٣؛ ٤؛ ٢٥؛ ٢٠

أ ٨٣ ج ٣٠
ب ٣٨ د ٢٥

**٢٢** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ٣٦ ٥٨٢ ٣٦٧ بۆنزیکترین سەدهەزار نزیکبکەوە.

أ ٣٦ ٥٠٠ ٠٠٠ ج ٣٦ ٦٠٠ ٠٠٠
ب ٣٦ ٥٨٠ ٠٠٠ د ٣٧ ٠٠٠ ٠٠٠

وانەی ٤

# هێڵی ڕوونکردنەوەیی

## graphical line

### فێربە

**پەیژە و هەنگاو** ئەم خشتەیە تێکڕای مانگانە بۆ پلەکانی گەرمی لەشاری پێنجوین دەنوێنێ.

| تێکڕای مانگانە بۆ پلەکانی گەرمی لەشاری پێنجوین | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| **مانگ** | شوبات | ئادار | نیسان | ئایار | حوزەیران | تەمووز |
| **تێکڕای** | ١٠° | ١٢° | ١٥° | ٢٠° | ٢٨° | ٣٣° |

دەتوانی هێڵی ڕوونکردنەوەیی بکێشی بۆ ئەوەی بزانی چۆن پێدراوەکان بە درێژایی کات دەنوێنێ، لەبەرئەوە پێویستە یەکەمجار پەیژە و هەنگاو دیاریبکەی.

**پەیژەی ژمارەکان** زنجیرە ژمارەیەکە لە سفرەوە دەستپێدەکات و بەدوورییەکی یەکسان لەسەر تەوەرەی ستوونی دادەنرێت لەوێنەی ڕوونکردنەوەیی.

**هەنگاو** بریتییە لە جیاوازی نێوان ژمارەیەك و ئەو ژمارەیەی کە ڕاستەوخۆ لە پەیژەکەدا بەدوایادادێت.

**پێداچوونەوەی خێرا**

چ پەیژەیەکی ژمارەیی بۆ نواندنی کۆمەڵێك لەپێدراوەکان بەکاردێنی.

١) ٢٤؛ ١٠؛ ١٥؛ ٨؛ ١٩

٢) ٢؛ ٥؛ ٧؛ ٨؛ ١١

٣) ٥٠؛ ٤٨؛ ٥١؛ ٥٤؛ ٥١

٤) ٧٥؛ ٧٨؛ ٧٠؛ ٦٦؛ ٧١

٥) ٩٥؛ ٨٠؛ ١٠١؛ ٨٧؛ ٩٩

**زاراوەکان**

پەیژەی ژمارەیی numerical dgree

هەنگاو Step

### چالاکی

پەیوەست

**هەنگاوی ١**

پەیژەیەکی ژمارەیی بۆ پێدراوەکان دیاربکە کاتێك پلەی گەرمایی دەگاتە نێوان ١٠ و ٣٣. پلە لە ٠ بۆ ٣٥.

ئەو هەنگاوە کە گونجاوە بۆ پێدراوەکان هەڵبژێرە. هەنگاوەکە ٥.

**هەنگاوی ٢**

هەمیشە پەیژەی ژمارەیی بۆ وێنەی ڕوونکردنەوەیی بە سفر دەستپێدەکات.

لەبەرئەوەی پێدراوەکان لە نێوان ٠° و ١٠° دا نیە، پچڕان لە پەیژەی ژمارەییدا بە بەکارهێنانی هێڵی شکاوە دەردەکەوێت.

ماوە یەکسانەکان لەسەر تەوەرەی ستوونی دیاربکە و ژمارەکان لەسەری بە پەیژە دابنێ.

## هەنگاوی ٣

ماوە یەکسانەکان لەسەر تەوەرەی ئاسۆیی دیاربکە.

مانگەکان لە خوارەوە بنووسە بەمەرجێك لەگەڵ تەوەرەکەدا تەریب بێت.

ناونیشانێك بۆ هەریەکە لە وێنە ڕوونکردنەوەیی و تەوەرەی ئاسۆیی و ستوونی بنووسە.




## هەنگاوی ٤

جووتە ڕێکخراو بۆ پێدراوەکانی (شوبات، ١٠) (ئازار، ١٢) (نیسان، ١٥) (ئایار، ٢٠) (حوزەیران، ٢٨) (تەمووز، ٣٣) بنووسە.

لەسەر وێنەی ڕوونکردنەوەیی، خاڵە گونجاوەکان بۆ ئەم جووتە ڕێکخراوانە دیاریبکە.

ئەم خاڵانە بە هێڵە ڕاستەکان پێکەوەببەستە.




- وێنە ڕوونکردنەوەییەکە لەسەر گۆڕانی پلەکانی گەرما لە شاری پێنجوین چی دەردەخات؟



## ساغبکەوە

١ مەبەست لە نووسینی ناونیشانەکان بۆ هەریەك لە وێنە ڕوونکرەوەکە و دوو تەوەرەکە چیە؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان. هێڵی ڕوونکردنەوەی پێشوو بۆ شیکاری پرسیاری ٢ تا ٥ بەکاربهێنە.**

٢ کام مانگ پلەی گەرما تێیدا بەرزترینە؟

٣ کام مانگ پلەی گەرما تێیدا نزمترینە؟

٤ ئایا پلەی گەرما لە مانگی شوبات تا مانگی تەمووز بەرز دەبێتەوە یان نزم دەبێتەوە؟ چۆن ئەمە دەزانیت؟

٥ ئەگەر لەسەر تەوەرەی ستوونی ماوەکان بەکاربێت کە درێژی هەر یەکەیان ١ بێت شوێنی خاڵەکانی کە جووتە ڕێکخراوەکە دەینوێنێ چۆن دەبێت؟

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٦ تا ٨ بەکاربهێنە.

| پلەکانی گەرما لە شاری دۆکان | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ڕۆژ | دوو شەممە | سێ شەممە | چوار شەممە | پێنج شەممە |
| پلەی گەرمی | ٣٨ | ٣٦ | ٣٤ | ٣٦ |

٦ ئەگەر ویستت هێڵی ڕوونکردنەوەیی بۆ ئەم پێدراوانە دروستبکەی، چ ناونیشانێکی بۆ هەڵدەبژێری؟ ناونیشان بۆ هەردوو تەوەرەکە چیە؟

٧ پەیژەیەك لە تەوەرەی ستوونی هەڵدەبژێری؟ هەنگاوەکە چیە؟

٨ ڕۆژەکان کە لە خوارەوەی وێنە ڕوونکردنەوەییەکە دەردەکەون کامانەن؟

**هێڵی ڕوونکردنەوەیی بۆ هەرکۆمەڵێك لە پێدراوەکان بکێشە، پێدراوە دیارەکان لە وێنە ڕوونکردنەوەییەکەتدا پێناسە بکە.**

٩

| تێکڕای باران بارین بە (سنتیمتر) | | | | |
|---|---|---|---|---|
| مانگ | ك ٢ | شوبات | ئازار | نیسان |
| تێکڕای بارین | ٢ سم | ٣ سم | ٢ سم | ١,٥ سم |

١٠

| ئۆتۆمبیلە فرۆشراوەکان لەمانگێکدا | | | | |
|---|---|---|---|---|
| مانگ | ت١ | ت٢ | ك١ | ك٢ |
| ئۆتۆمبیلە فرۆشراوەکان | ١٨ | ٢٧ | ٣٥ | ٢٥ |

١١

| ئامادەبووانی یاری خلیسکێنە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| هەفتە | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| ژمارەی کەسەکان | ١٥٠ | ١٥٥ | ١٦٥ | ١٨٠ | ١٨٥ |

١٢

| خەرجی مانگانەی مۆبایل بەهەزار دینار | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| مانگ | نیسان | ئایار | حوزەیران | تەمووز | ئاب |
| گوژمەکە | ٨٠ | ١٠٠ | ٩٥ | ٩٠ | ١٠٥ |

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** هێڵی ڕوونکردنەوەیی بۆ شیکاری پرسیاری ١٣ تا ١٩ بەکاربهێنە.

١٣ جووتە ڕیکخراوی (کانوونی یەکەم، ٣,٢) لەلای تۆ چی دەگەینێ؟




١٤ ناوەندە باران بارین لەشاری دۆکان لەمانگی ئازار تامانگی ئایار زیاد دەکات یان کەم دەکات. چۆن ئەوە دەزانیت.

١٥ ئەگەر پێدراوەکان ناوەندی ٢,٢ لەمانگی حوزەیران تێدابێت. ئایا وێنە ڕوونکردنەوەییەکە دەگۆڕێ؟ چۆن هێڵەکە لە وێنە ڕوونکردنەوەییەکە دەگۆڕێت؟

١٦ جیاوازی نێوان ناوەندە باران بارین لە دوو مانگی کانونی دووەم و نیسان چەندە؟

١٧ باران بارین لە شاری دۆکان لەمانگی کانونی دووەم تا مانگی ئایار ڕیزبکە.

١٨ **بنووسە** هێڵی شکاوە لەژێر تەوەرەی ستوونی چی دەنوێنێ؟ ڕوونیبکەوە.

١٩ **پرسیارێك بنووسە** پێدراوەکان لەوێنە ڕوونکردنەوەییەکان بەکاربهێنە.

**٢٠** باوکی سواره ٠٠٠ ١٧٥ دیناری دا لەبڕی نرخی دوو کارتی ئامادەبوون لە ئاهەنگی ڤیستیڤاڵی هونەر لە شاری هەولێر. نرخی کارتی سواره ٠٠٠ ٢٥ دیناری لە نرخی کارتی باوکی کەمترە. نرخی هەر کارتێك چەندە؟

**٢١** پلەی گەرمی لە چۆمان لە نیوەڕۆدا ٢٧ پلەیە. لە نیوەی شەودا ٢٣ پلە دابەزی بەهۆی بای ساردەوە. لەنیوەی شەودا پلەی گەرمی بووبە چەند؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٢** لە بچووکترینەوە بۆ گەورەترین ڕیزبکە.
٥,٠٢، ٥,٢٢، ٥,٠٢٢، ٥,٠٠٢.

**٢٣** ناوەند و ناوەڕاستە و مۆد دیاربکە بۆ:
١٧؛ ١٤؛ ١٠؛ ١٧؛ ١٨؛ ٢٢؛ ١٤

**٢٤** نەسرین لەسەر کاری دەستی بۆماوەی ٦٥ خولەك خۆی ڕاهێنا، واتە بە ٢٠ خولەك زیاتر لەماوەی ڕاهێنانی لەڕۆژێکی ئاساییدا چەند خولەك ڕاهێنان دەکات؟

**٢٥**
٨٥ ٥٠٦
٥ ٥٠٦+

**٢٦**
٣٥ ٢٢١
٧ ٢٦١−

**٢٧** ٢٥ + ن ئەژمێربکە کاتێك ن = ٣٦

**٢٨** ك − ٥ = ٢٣شیکاربکە.

**٢٩** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ٣,٤٥٠٦ بۆ نزیکترین بەش لەسەد نزیکبکەوە.

| | |
|---|---|
| أ ٣,٤٥ | ج ٣,٤٥٦ |
| ب ٣,٤٥١ | د ٣,٥ |

**٣٠** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ٨ ٧٤٥ ١٢٣ بۆ نزیکترین هەزار نزیکبکەوە.

| | |
|---|---|
| أ ٨ ٧٠٠ ٠٠٠ | ج ٨ ٧٥٠ ٠٠٠ |
| ب ٨ ٧٤٥ ٠٠٠ | د ٩ ٠٠٠ ٠٠٠ |

## شیکاری پرسیارەکان — گۆشەی ڕوونا کبیران



**پوختەی ئەنجامەکان** ئەم هێڵە ڕوونکردنەوەییە ژمارەی هێلانەی هەڵۆ سەرسپییەکان لە کارولینای خواروو لەماوەی ٨ ساڵدا دەنوێنێ.

پێدراوە هاتووەکانی ناو ئەم وێنە ڕوونکردنەوەییە بۆ پوختەکردنی ئەنجامەکان بەکاربهێنە.




**١** چۆن ژمارەی هێلانەی هەڵۆکان لە ساڵی ١٩٩٠ تا ١٩٩٨ دەگۆڕێ؟

**٢** ڕوونیبکەوە کام دوو ساڵ ژمارەی هێلانەکان نزیکەی هەمان ژمارەیە؟

**٣** بە پشت بەستن بەپێدراوە هاتووەکانی سەر هێڵە ڕوونکردنەوەییەکە. ئایا مەزندە دەکەیت ژمارەی هێلانەکان لەساڵی ٢٠٠٥ زیادبکات یان کەم؟

وانەی
٥

# ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان
## وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی پێکبهێنە

## Problem Solvin Strategies:
### make a graph



**پێداچوونەوەی خێرا**

مەودا لەکۆمەڵەی ژمارەکان بدۆزەوە.

١ ٨؛ ٦؛ ١٥؛ ١٢؛ ٩؛ ١١

٢ ٢٤؛ ١١؛ ٢١؛ ٢٤؛ ١٣؛ ١٨

٣ ٥٨؛ ٤٦؛ ٥٥؛ ٥٤؛ ٥١

٤ ٨١؛ ٧٨؛ ٨٤؛ ٨٠؛ ٨٢

٥ ١١٠؛ ١٠٥؛ ١١١؛ ٩٧؛ ١٠٠

**پرسیار** میران ڕای هەندێك قوتابی لەسەر باشترین هۆكار بۆیارمەتی نەداران وەرگرت. خشتەیەکی ڕێکخست بۆ نیشاندانی پێدراوەکان.

**هۆکارە باشەکان بۆ یارمەتیدانی نەداران**

| | ناندان | پارە بەخشین | پۆشاک بەخشین |
|---|---|---|---|
| کچان | ٤ | ٦ | ٥ |
| کوڕان | ٤ | ٨ | ٣ |

ئەم پێدراوانە بە ڕێگەیەکی تر بنوێنە تا یارمەتیت بدات لەسەر بەراوردکردن .



### تێبگـــە

- داواکار چییە؟
- پێدراوەکان کە بەکاری دەهێنی کامەیە؟
- ئایا پێدراوی تر هەیە کە بەکاری نەهێنی؟ ئەگەر وەڵامت بە بەڵێ بوو، ئەو پێدراوە چییە؟

### پلاندانێ

- کام ڕێگا بەکاردەهێنیت بۆ شیکاری پرسیارەکە؟

دەتوانی وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی پێکبهێنی بۆ خستنە ڕووی پێدراوەکان.

**چالاکیە پەسندکراوەکان بۆ یارمەتیدانی نەداران**




### شیکاربکە

- کام وێنەی ڕوونکردنەوەیی بەکاردەهێنی؟

دەتوانی ئەستوونی ڕوونکردنەوەیی جووتەنی بۆ بەراوردکردنی هۆکاری کچان و کوڕان پێکبهێنی. ئەو ئەستوونە ڕوونکردنەوەییە جووتەییە یارمەتیدەدات لە بەراوردکردنی دوو کۆمەڵە لە پێدراوەکان لەناو یەك وێنەی ڕوونکردنەوەییدا.

ئەم ئەستوونە ڕوونکردنەوەییە جووتەنیە ئەوە نیشاندەدات کە ژمارە زۆرەکە لە کوڕان و کچان پارە بەخشینیان پێ پەسندترە.

### ساغبکەوە

- ئەو ڕێگایەی تر کە دەتوانی بەکاریبهێنی کامەیە؟

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

١ ئەگەر دوو کچ و چوار کوڕ چوونە پاڵ ئەو قوتابیانەی کە پارە بەخشینیان پێ پەسندترە. ئایا پەیژەی ژمارەیی و هەنگاوەکە لە وێنەی ڕوونکردنەوەیی دەگۆڕێ؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٢ تا ٤ بەکاربهێنە. بەرپرسی کتێبخانە ڕای هەندێك قوتابی لەسەر کتێبە نوێیەکان وەرگرت، کە دەیانەوێت بیخوێننەوە. پێدراوەکان لەم خشتەیە تۆمارکرا؟

| کتێبە نوێیەکان | چیرۆك | شیعر | زانست |
|---|---|---|---|
| کوڕان | ٢٠ | ١٤ | ٢٥ |
| کچان | ٣١ | ١٠ | ٢٨ |

### ڕێگاکانی شیکاری پرسیارەکان

هێلکارییەك یان وێنەیەك بکێشە
نموونەیەك پێکبهێنە یان کردارێك جێبەجێبکە.
لیستێکی ڕێکخراو پێکبهێنە
بەدوای شێوازێکدا بگەڕێ.
**خشتەیەك یان وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی پێکبهێنە**
بخەمڵێنە و ساغبکەوە
بەهەنگاوەکانتا بچۆوە
پرسیارێکی ئاسان شیکاربکە
هاوکێشەیەك بنووسە

٢ ئەستوونی ڕوونکردنەوەیی جووتەنی پێکبهێنە بۆ بەراوردکردنی هەڵبژاردنەکانی کوڕان و کچان.

٣ پەیژەی ژمارەیی و هەنگاو بۆ وێنەی ڕوونکردنەوەیی دیارییکە.

أ پەیژە: لە ٠ تا ٦٠ هەنگاو: ١٠
ب پەیژە: لە ٠ تا ٣٥ هەنگاو: ٥
ج پەیژە: لە ٠ تا ١٠٠ هەنگاو: ١٠
د پەیژە: لە ٠ تا ١٠٠ هەنگاو: ٥

٤ کام لەم پێدراوانەی خوارەوە ڕاست نیە؟

أ چیرۆکەکان زۆرترین خواستیان هەیە لەنێوان قوتابیاندا.
ب کوڕان کتێبی شیعریان زۆرتر لە کچان هەڵبژاردووە.
ج کوڕان کتێبی زانستیان زۆرتر لەکچان هەڵبژاردووە.
د ژمارەی ئەو کوڕانەی کە هاوبەشیان لە ڕاوەرگرتنەکاندا کردووە کەمتربوون لەکچان.

## جێبەجێکردنە جیاوازەکان

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٥، ٦ بەکاربێنە.

| میوە پەسندکراوەکان | | |
|---|---|---|
| میوە | کەسوکار | قوتابیان |
| سێو | ٦٠ | ٧٢ |
| کاڵەك | ٨٤ | ٦٥ |
| پرتەقاڵ | ٧٨ | ٧٥ |
| مۆز | ٥٠ | ٤٢ |

٥ ڕای هەندێ قوتابی و کەسوکار لەسەر جۆری میوەی پەسندکراو وەرگیرا. ئەستوونی ڕوونکردنەوەیی جووتەنی پێکبهێنە بۆ پیشاندانی ئەنجامی وەرگرتنی ڕاکان. کام میوە پەسندکراوە لەلای قوتابیان. لای کەسوکار؟

٦ چەند کەس هاوبەشیان کرد لە ڕاپرسیەکەدا؟

٧ تیپی باسکەی دهۆك ٥ یاریان ئەنجامدا. ١٠١٨ کارتیان لەیەکەم یاریدا فرۆشت و ٦٥٠ کارتیش لە دووەمدا و لە یارییەکانی تریشدا ٨٣٥ کارت، ١١٨٦ کارت، ٩٤٦ کارت. ناوەندی ئەم پێدراوانە چەند؟

٨ **ڕێنوێنی** ڕاوێژ ژمارەی کارتی بەئەندامبوونی بۆ یانە وەرزشیەکە لە بیرچووە، بەڵام بە بیری هاتەوە کە ژمارەکە کەوتۆتە نێوان ١ و ١٢٠، وەنووسی هەموویان تاکن وسەرجەمیشیان ١١یە، ژمارەی کارتی ڕاوێژ چەندە؟

بەشی ٤

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

**دەربڕینی گونجاو لە لیستی بەرامبەردا هەڵبژێرە.**

١ ئەگەر پێدراوەکانت کۆکردەوە و سەرجەمەکەت بەسەر ژمارەی پێکهاتەکانی کۆکراوە دابەشکرد ___؟___ بەدەست دەهێنی.

٢ ___؟___ ژمارەیەکە یان چەند ژمارەیەك لە خشتەی پێدراوەکاندا لەهەموویان زیاتر دەردەکەوێت.

٣ ئەژمێرکردنی ___؟___ بۆ کۆمەڵێك لە پێدراو. بچووکترین بەها لە گەورەترین بەها لە کۆمەڵەکە دەربکە؟

خشتەی سەرژمێری
computation table
دووباوەبونەوەی کەڵەکەبوو
cumulative frequency
mean ناوەند
mode مۆد
هێڵی ڕوونکردنەوەیی
graphical line
پلەی ژمارەیی
numerical degree
range مەودا

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

**خشتەی سەرژمێری بۆ شیکاری پرسیاری ٤ تا ٦ بەکاربهێنە.**

| پەیوەندییەکانی ڕێکار | |
|---|---|
| ڕۆژ | ژمارە |
| دووشەممە | 𝍸 \|\|\|\| |
| سێشەممە | \|\|\|\| |
| چوارشەممە | 𝍸 𝍸 |
| پێنجشەممە | 𝍸 𝍸 \|\|\|\| |
| هەینی | 𝍸 \|\|\| |

٤ خشتەی دووبارەبوونەوەی کەڵەکەبوو بۆ پێدراوەکان پێکبهێنە؟

٥ لە چ ڕۆژێکدا ژمارەی پەیوەندییەکانی ڕێکار زۆرتربوو؟ کەمتربوو؟

٦ ژمارەی گشتی پەیوەندییەکانی ڕێکار چەندە؟

**مەودا و ناوەند و ناوەڕاستە و مۆد بۆ هەریەك لە کۆمەڵە پێدراوەکان دیاربکە.**

٧ ٨؛ ٩؛ ١١؛ ٤؛ ٨

٨ ١٥؛ ١١؛ ٢٠؛ ١٢؛ ١٢

٩ ٦٣٥؛ ٤٩٩؛ ٧١٧

**پەیژەیەکی ژمارەی شیاو بۆ پێدراوەکان دیارییکە.**

١٠ جوان ٤ ئامێری کارەبایی کڕی نرخەکانیان:
٣٠٠ هەزار دینار؛ ٤٥٠ هەزار دینار
٤٨٠ هەزار دینار؛ ٥٣٠ هەزار دینار

١١ تێکڕای کیلۆمەتر بۆ یەك دەبە بەنزین بۆ هەندێك ئۆتۆمبیل. ٢٦٠، ١٧٠، ٢٣٠، ١٢٠، ٢٨٠

**باشترین وێنە ڕوونکردنەوەیی بۆ نواندنی پێدراوەکان هەڵبژێرە.**

١٢ پارەی بەدەستهاتوو لە ٥ هەفتەدا.

١٣ ژمارەی ئۆتۆمبیلەکان لە ٤ شاردا.

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ١٤ و ١٥ بەکاربهێنە.**

| باشترین جۆری فلیمەکان | | |
|---|---|---|
| جۆر | کچان | کوران |
| کۆمیدی | ١٠ | ١٦ |
| کۆمەڵایەتی | ١٥ | ٢٠ |
| زانستی | ٣ | ٢٥ |
| مێژووی | ١٥ | ١٥ |

١٤ باشترین وێنەی ڕوونکردنەوەیی بۆ پیشاندانی پێدراوەکان دروستبکە.

١٥ لەکام جۆریان جیاوزای نێوان ژمارەی کچان و کوران زۆرترە؟

بەشی ٤

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep

ئاگاداربە! CAUTION!

### لابردنی هەڵبژاردنەکان

براونە وێنەی ڕوونکردنەوەیی پرسیاری ٥ بۆ دیاریکردنی دوو ڕۆژ کە زۆرترین پلەی گەرمی لەنێوانیاندا دەرکەوێت. دەتوانی هەر هەڵبژاردنێك لاببەی لەگەڵ خواستەکەدا نەگونجێت.

**وەڵامی ڕاست بۆ شیکاری پرسیارەکانی ١ تا ٦ هەڵبژێرە.**

**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ١ تا ٣ بەکاربهێنە.**

| وەرزشە پەسندکراوەکان | |
|---|---|
| وەرزش | ژمارەی دەنگەکان |
| تۆپی باڵە | ٣٠ |
| تۆپی باسکە | ٢٠ |
| تۆپی تێنسی سەرزەوی | ١٥ |
| تۆپی تێنس | ١٠ |

١ کام وێنەی ڕوونکردنەوەیی گونجاوترە بۆ پیشاندانی پێدراوەکانی وەرزشە پەسندکراوەکان لە خشتەکەدا ؟

أ ئەستوونە ڕوونکردنەوەیی
ب خشتەی دووبارەبون
ج هێڵی ڕوونکردنەوەیی
د ئەستوونی ڕوونکردنەوە جووتەنی

٢ کام هەنگاو گونجاوترە بۆ نواندنی پێدراوەکان بە ڕوونکردنەوەیی.

أ ١ ب ٥ ج ١٥ د ٢٠

٣ مەودای دەنگەکانی وەرزشی پەسندکراو کامەیە؟

أ ١٠ ب ١٥ ج ٢٠ د ٣٠

**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٤ تا ٦ بەکاربهێنە.**




٤ ڕۆژی هەینی پلەی گەرمی چەندبوو؟

أ ٣٠° ب ٢٨° ج ٢٦° د ٢٤°

٥ کام دووڕۆژ پلەی گەرمی لەنێوانیاندا زۆربەرزە؟

أ شەممە و یەکشەممە
ب دووشەممە و سێشەممە
ج سێشەممە و چوارشەممە
د چوارشەممە و پێنجشەممە

٦ لەنێوان کام دوو ڕۆژ پلەی گەرمی گۆڕانی بەسەردانەهات؟

أ هەینی و شەممە
ب شەممەو یەکشەممە
ج چوارشەممە و پێنجشەممە
د دووشەممە وسێشەممە

### ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know

٧ لەسەر تۆڕی چوارگۆشەکان خاڵەکانی (١، ١)، (٤، ١)، (٧، ٤)، (١، ٧) دیاریبکە. نێوان خاڵەکان بەیەکبگەیەنە. چ شێوە ئەندازەیەکت دەستکەوت؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

٨ شادمان وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی دروستکرد گۆڕانی ژمارەی دانیشتوان لەهەرێمی کوردستان بەدرێژایی ٥٠ ساڵ دەنوێنێ. شاد وێنەیەکی ڕوونکردنەوەیی دروستکرد گۆڕانی ژمارەی قوتابیان لە قوتابخانەکەی بەدرێژایی ٥٠ ساڵ دەنوێنێ. هۆکاری جیاوازی دوویەیژە لەو دوو وێنە ڕوونکردنەوەییە ڕوونبکەوە.

بەشی ٥

# لێکدانی ژمارەکان

## Multiply Numbers



درێژی باڵندەی بەزرنگە ٦٠ ملم

نزیکەی ١٠ ملیۆن جۆر لە گیانەوەران هەیە. گیانەوەران لە بارستایی و قەبارەدا جیاوازی گەورەیان هەیە چۆلەکەی بەزرنگە نزیکەی هەمان قەبارەی تۆپی گۆڵفی هەیە، بەڵام بارستایی تۆپی گۆڵف بە ٢٨ جار لە بارستیای چۆلەکەی بەزرنگە قورسترە.

**پرسیار بۆ شیکار:** ئەم خشتەیە بارستایی هەندێك لە گیانەوەرە قورس و سوکەکان دەردەخات. بارستایی تۆپی گۆڵف نزیکەی چەند کیلۆگرام دەبێت؟

| بارستایی گیانەوەران | | |
|---|---|---|
| باڵندە | گیانەوەر | بارستایی بەکیلۆگرام |
| سوکترین باڵندە | چۆلەکە بەزرنگە | ٠,٠٠١٦ |
| سوکترین مەمکداری دەشتی | شەمشەمەکوێرە | ٠,٠٠٢ |
| قورسترین مێروو | قاڵۆچەی غولیا | ٠,٠٩٩ |
| قورسترین باڵندە | وشترمل «نەعامە» | ١٤٨,٥ |
| قورسترین ماسی | ماسی خۆر | ١٩٨٠ |
| قورسترین مەمکداری دەشتی | فیلی ئەفریقی | ٧٠٠٠ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان

| |
|---|
| ژمارە دەییە هاوتاکان equivalent decimal |
| بەشێك لەسەد hundredth |
| دە ten |
| دەیەك tenths |
| بەشێك لەهەزار thousandth |

**دەربڕینی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.**

١ ___؟___ بەشێك لە ١٠ بەشی یەکسان لەیەك.

٢ ___؟___ بەشێك لە ١٠٠ بەشی یەکسان لەیەك.

٣ ژمارە دەییەکان کەهەمان هێند نیشان دەدەن پێیان دەوترێ ___؟___

## کۆکردنەوەی دووبارەبوونەوە بۆ ژمارە دەییەکان

**کۆبکەوە.**

٤ ٠,١ + ٠,١ + ٠,١ + ٠,١

٥ ٠,٦ + ٠,٦ + ٠,٦

٦ ٠,٣ + ٠,٣ + ٠,٣ + ٠,٣

٧ ١,١ + ١,١ + ١,١

٨ ٠,٩ + ٠,٩ + ٠,٩

٩ ١,٢ + ١,٢

١٠ ٠,٢ + ٠,٢

١١ ٠,٣ + ٠,٣ + ٠,٣

١٢ ٠,٥ + ٠,٥ + ٠,٥ + ٠,٥

## لێکدان لەژمارەی دوو ڕەنووسی

١٣ ١٢ × ٦

١٤ ١٩ × ٩

١٥ ١٤ × ١٢

١٦ ١٧ × ٤

١٧ ٢٩ × ٢٤

١٨ ٣٤ × ٢٧

١٩ ٧٢ × ٣١

٢٠ ٩٣ × ٤٥

## لێکدانی ژمارەیەکی ٣ ڕەنووسی لە ژمارەیەکی ١ ڕەنووسی.

٢١ ١٣٠ × ٦

٢٢ ١٣٤ × ٤

٢٣ ١٠٤ × ٥

٢٤ ٢٦٠ × ٩

٢٥ ٢٥٠ × ٢

٢٦ ١١١ × ٣

٢٧ ٢١٤ × ٣

٢٨ ٧٧٦ × ٤



**پێداچوونەوەی خێرا**

1. ٤ × ٢٢
2. ٤٠ × ٦
3. ٥ × ١١
4. ٧٠ × ٦٠٠
5. ٣٠ × ٣٢

# ١ لێكدانی ژمارەی سروشتی

## Multiply Natural Numbers

**پێشبڕكێ** زۆراب لە بەرنامەی ڕاهێنانی پاسكیل سواری بەشداربوو، بۆ خۆئامادەكردن بۆ پێشبڕكێكە. هەفتەی ٣٣٥ خولەك بۆ ماوەی ٢٦ هەفتە ڕاهێنانی كرد.

زۆراب چەند خولەك ڕاهێنانی كردووە؟

### نموونە

لێكبدە ٣٣٥ × ٢٦

بخەملێنە ٣٠ × ٣٠٠ = ٩ ٠٠٠

**هەنگاوی ١**

لەیەكان بدە

```
   ٣
  ٣٣٥
  ٢٦ ×
 -----
 ٢٠١٠   ⟵  ٣٣٥ × ٦
```

**هەنگاوی ٢**

لە دەیان بدە

```
   ١
   ٣
  ٣٣٥
  ٢٦ ×
 -----
 ٢٠١٠
 ٦٧٠٠   ⟵  ٣٣٥ × ٢٠
```

**هەنگاوی ٣**

هەردوو ئەنجامی لێكدان كۆبكەوە

```
   ١
   ٣
  ٣٣٥
  ٢٦ ×
 -----
 ٢٠١٠
 ٦٧٠٠ +
 -----
 ٨٧١٠
```

ئەنجامی لێكدانی هەردوو بەشەكە

كەواتە زۆراب ٨ ٧١٠ خولەك ڕاهێنانی ئەنجامدا لەبەرئەوەی ٨ ٧١٠ نزیكە لە خەملاندنی ٩ ٠٠٠ كەواتە، وەڵامەكە شیاوە.

### نموونەی زیاتر

**أ**

```
   ٧
   ٢٩
  ١٨ ×
 -----
  ٢٣٢   ⟵  ٢٩ × ٨
  ٢٩٠ + ⟵  ٢٩ × ١٠
 -----
  ٥٢٢
```

**ب**

```
    ١
   ٧٠٤
   ٢٣ ×
 ------
  ٢١١٢    ⟵  ٧٠٤ × ٣
 ١٤ ٠٨٠ + ⟵  ٧٠٤ × ٢٠
 ------
 ١٦ ١٩٢
```

**ج**

```
   ٢ ٢١
   ١ ١
  ٢ ٣٤٢
   ٦٤ ×
 -------
   ٩ ٣٦٨   ⟵  ٢٣٤٢ × ٤
 ١٤٠ ٥٢٠ + ⟵  ٢٣٤٢ × ٦٠
 -------
 ١٤٩ ٨٨٨
```

• سەیری نموونەی ب بكە. سفر لەیەكێك لەكۆڵەكاندا هەیە. چی بۆ ڕەنووسی كۆكراوەی ١ ڕوویداوە؟

▲ ساڵی ١٩٩٢ میغیل ئەندۆران لە پێشبڕكێی فەرەنسا بۆ پاسكیل سواری بەرزترین تێكڕای خێرایی بەدەستهێنا كە گەیشتە ٣٩,٣٥كم/ك.

**لەبیرت نەچێ** بۆئەوەی ژمارەیەك لە ژمارەیەكی دوو ڕەنووسی بدەی، یەكەمجار لە یەكان بدە، پاشان لە دەیان. دوای ئەوە ئەنجامی لێكدانی ئەو دوو بەشە كۆبكەوە.

## ساغبکەوە

**١** **ڕێنوێنی** ڕوونیبکەوە بۆچی ئەنجامی لێکدانی بەشی دووەم گەورەترە لەئەنجامی لێکدانی بەشی یەکەم لەکرداری لێکدانی ژمارەیەك لە ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی.

**لێکبدە. بخەملێنە بۆ ساغکردنەوە**

**٢** ٩١ × ٤٣

**٣** ٣٤٨ × ١٥

**٤** ٢٤ × ١٦

**٥** ١ ٩٢٤ × ٢١

**٦** ١٣ × ٧١٠

**٧** ٦١ × ٨٠١

**٨** ٩٤ × ٤ ٥٠٦

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**لێکبدە. بخەملێنە بۆ ساغکردنەوە**

**٩** ٨٧ × ٥٣

**١٠** ١٥٩ × ٢٦

**١١** ٥٠٠ × ٤٣

**١٢** ٢ ٣٩١ × ٦٢

**١٣** ٨ ٧٠٥ × ٩٨

**١٤** ٥٢ × ١٦

**١٥** ٥٤ × ١١٩

**١٦** ٦٣ × ٢ ٦١٠

**١٧** ١٢ × ٣ ٠٥٩

**جەبر** بەهای هەریەك بدۆزەوە کاتێك ن = ١٠، ٢٠، ٣٠.

**١٨** ١١ ن

**١٩** ن × ٢٣

**٢٠** ٢٠٠ × ن

**٢١** ٣٢ ن

**٢٢** ١٤ × ن

**پێدراوەکانی خشتەکە کۆپیبکە و لە شیکاری پرسیاری ٢٣ تا ٢٦ بەکاریبێنە.**

لێدانی باڵەکان

| | گیانەوەر | لەخولەکێك | لەکاتژمێرێك |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | پاساری بەزرنگە | ٥ ٤٠٠ | ■ |
| ٢٤ | شەمشەمەکوێری بەزرنگە | ١ ٢٠٠ | ■ |
| ٢٥ | پەپوولە | ٦٤٠ | ■ |
| ٢٦ | لەقلەق | ١٨٠ | ■ |

**٢٧** **ڕێنوێنی** باڵندەی پەرەسێلکە باڵەکانی دووئەوەندە خێراتر لە لەقلەق دەجولێنی. تیکڕای ژمارەی جولانی باڵەکانی لەهەفتەیەکدا چەندە؟

**٢٨** **پرسیارێك بنووسە** بتوانرێ شیکار بکرێ بە بەکارهێنانی لێکدان لە پێدراو لە بارەی جولانی لێدانی باڵەکان.

**٢٩** ئەگەر لەقلەق باڵەکانی بە ٣٠ جار خێراتر لەوەی کە هەیەتی بجولێنی، چۆن ئەوکاتە دەتوانی بەراوردی بکەیت لەگەڵ چۆلەکەی بەزرنگە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**ژمارەیەکی دەیی هاوتا بنووسە.**

**٣٠** ٠,٢٣

**٣١** ٨,٠٢٠

**٣٢** (٣٦٥ × ن) − ١٢ئەژمێربکە، کە ن = ٨

**٣٣** ٨٧ ٥٦٤ + ٦٩ ٥٢١

**٣٤** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — قوتابیان لە گەشتێکتدا لە شاری سلێمانی بۆ شاری هەولێر ماوەی ٢٢٠کم بە خێرایی ٥٥کم/ك بڕی. گەشتەکە چەند کاتژمێری خایاند؟ کام هاوکێشە پرسیارەکە دەنوێنێ؟

أ ٥٥ + س = ٢٢٠

ج س × ٤ = ٥٥

ب ٥٥ × س = ٢٢٠

د ٥٥ − س = ٢٢٠

وانەی
٢



پێداچوونەوەی خێرا

١ ٩ × ٥٠

٢ ٨ × ٦٠ ٣ ٤ × ٧٥

٤ ٥ × ١٢ ٥ ٨ × ٥٠




# لێکدانی ژمارەیەکی سروشتی لە ژمارەی دەیی

## Multiply Nattural Number by decimal

### بدۆزەرەوە



کەنغەر کلکی بۆ هاوسەنگی لە بازداندا بەکاردەهێنێ. درێژی کلکی ٠,٥٣ی درێژی جەستەی «لەشیەتی» دەبێت. درێژی جەستەی نزیکەی ٢م دەبێت. درێژی کلکی چەند دەبێت؟

**چالاکی ١** نموونەیەك دروستبکە بۆ نیشاندانی کرداری لێکدانی ٠,٥٣ لە ٢.

**هەنگاوی ١**

نموونەی بەشەکان لەسەد بەکاربهێنە ٠,٥٣ بەش لەسەد دووجار ڕەنگبکە. لەهەر جارێکدا ڕەنگی جیاواز بەکاربهێنە.



**هەنگاوی ٢**

ژمارەی بەشە ڕەنگکراوەکان لەسەد ئەژمێربکە ١٠٦ بەشی ڕەنگکراو لەسەداندا هەیە. واتە ١ و ٦ بەش لەسەد کەواتە ٢ × ٠,٥٣ = ١,٠٦.

کەواتە درێژی کلکی کەنغەر نزیکەی ١,٠٦ مەترە.

- ڕستەی لێکدانی ٢ × ٠,٥٣ لەگەڵ ڕستەی لێکدانی ٢ × ٥٣ بەچی لێکدەچن؟
- ئایا ئەنجامی لێکدانی ٣ لە ٠,٥٣ گەورەترە لە ٣ یان بچووکترە؟ بۆچی؟




### هەوڵبدە

بۆئەوەی لێکبدەی نموونەیەك دروستبکە.

أ ٤ × ٠,١٢

ب ٣ × ٠,٠٣

ج ٥ × ٠,٥

د ٣ × ٠,٣

## ببەستەوە

دەتوانی ڕستەی لێکدان بنووسی کە بگونجێت لەگەڵ ئەو نموونەی لەلاتە.

### چالاکی ٢

٣ × ٠,٦ ئەژمێربکە

**نموونە**

نموونەی دەییەکی بەکاربهێنە. ٠,٦ یان ٦ دەیەکی سێ جار ڕەنگبکە، لەهەر جارێکدا ڕەنگی جیا بەکاربهێنە. ژمارە دەیەکیە ڕەنگکراوەکان ئەژمێربکە. ١٨ دەیەکی هەیە، واتە ١ و ٨ دەیەکی.

**تۆمارکردن**

تۆماربکە

$$\begin{array}{r} ٠,٦ \\ \times\ ٣ \\ \hline ١,٨ \end{array}$$

ئەم نموونەیە بەکاربهێنە بۆ دانانی فاریزەکە

کەواتە ٣ × ٠,٦ = ١,٨

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**نموونەیەك پێکبهێنە بۆئەوەی لێکبدەی**

**١** ٣ × ٠,٨ **٢** ٦ × ٠,٤ **٣** ٥ × ٠,٦ **٤** ٢ × ٠,٨٢

**٥** ٧ × ٠,٠٣ **٦** ٢ × ٠,١٢ **٧** ٤ × ٠,١٩ **٨** ٩ × ٠,١٨

**براکەم لە کەنەدا نامەیەکی بۆ ناردم و لەنرخی میوەکان ئاگادارمی کردەوە. کە چۆن بە دانە دەیکرن. خشتەی بەرامبەر بەکاربهێنە بۆ ئەژمێرکردنی هەردانەیەك بەدۆلاری کەنەدی لە پرسیارەکانی ٩ تا ١٣.**

| بەرهەمەکانی میوە | |
|---|---|
| میوە | نرخی دانەیەك |
| سێو | ٠,٣٥ دۆلاری کەنەدی |
| مۆز | ٠,٢٠ دۆلاری کەنەدی |
| پرتەقاڵ | ٠,٢٨ دۆلاری کەنەدی |
| هەڵوژە | ٠,٢٤ دۆلاری کەنەدی |
| قۆخ | ٠,٣٩ دۆلاری کەنەدی |

**٩** ٣ سێو و ٢ مۆز.

**١٠** ٢ پرتەقاڵ و ٣ مۆز.

**١١** ٤ مۆز و ٢ پرتەقاڵ و قۆخێك.

**١٢** ٥ مۆز و ٣ پرتەقاڵ و ٢ هەڵوژە.

**١٣** ٨ سێو، ٦ مۆز و ١ پرتەقاڵ.

**١٤** **بنووسە** ڕوونیبکەوە چۆن نموونەیەك بۆ لێکدانی ٣ × ٠,٩ دەکێشی.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**١٥** هاوڕێ ئەم پلە گەرمیانەی تۆمارکرد: ٤٥، ٤١، ٣٥، ٣٨، ٣٨، ٤٣. ناوەندەیان چەندە؟

**١٦** بەهای ئەم برە چەندە؟
٩ × (٥ + ن)، کاتێك ن = ٦

**١٧** ٨٢ ٣٩٤ ٠٢١ بۆ نزیکترین ملیۆن نزیکبکەوە.

**١٨** ژمارە دەییەکی هاوتا بۆ ژمارە ٨,٠٢ بنووسە.

**١٩** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) کام ژمارە بچووکترە لەئەنجامی لێکدانی ٢١٧ لە ٥٠٨؟

أ ١١٠ ٢٣٠ ج ١١٠ ٣٢٦
ب ١١٠ ٣٢٠ د ١٢٠ ٢٣٠

وانەی ٣

# شێوازەکان لە لێکداندا

## Patterns in Multiplication



### پێداچوونەوەی خێرا

١) ١٠ × ١٢

٢) ١٠٠ × ١٢

٣) ١ ٠٠٠ × ١٢

٤) ١٠ ٠٠٠ × ١٢

٥) ١٠٠ ٠٠٠ × ١٢

### فێربە

**بۆقە بچووکەکان** بچووکترین بۆق لە نیوەگۆی باکوری زەوی لەکوبا دۆزاریەوە. درێژییەکەی ٠,٩٨سم. دوو وێنەکە پێوانی ڕاستەقینە و پێوانەی گەورەکراو بە ٥ ئەوەندە دەنوێنێ. درێژی بۆقەکە لە وێنەیەکدا ١ ٠٠٠ جار گەورە بێت چەندە؟



▲ وێنەی بۆقەکە کە ٥ ئەوەندە گەورەکراوە



▲ پێوانەی ڕاستەقینەی بۆقەکە

### نموونە

لێکبدە ٠,٩٨ × ١ ٠٠٠

بەدوای شێوازێ بگەڕێ

٠,٩٨ × ١ = ٠,٩٨

٠,٩٨ × ١٠ = ٩,٨٠ ⟵ فاریزەکە یەك خانە بۆلای ڕاست بگوێزەوە

٠,٩٨ × ١٠٠ = ٩٨,٠٠ ⟵ فاریزەکە دووخانە بۆلای ڕاست بگوێزەوە

٠,٩٨ × ١ ٠٠٠ = ٩٨٠,٠٠ ⟵ فاریزەکە سێ خانە بۆلای ڕاست بگوێزەوە

کەواتە، درێژی بۆقەکە ٩٨٠سم لە وێنەکەدا کە ١ ٠٠٠ جار گەورەکراوە

- **ئەگەر** وێنەی بۆقەکە ١٠٠ جار گەورە بکرێت. درێژی بۆقەکە دەبێتە چەند؟

**لەبیرت نەچێ** لەکاتی لێکدانی ژمارەیەکی دەیی لە ١٠، یان ١٠٠، یان ١ ٠٠٠ فاریزەکە بۆلای ڕاست دەگوێزرێتەوە کە یەکسان بێت بە ژمارەی سفرەکان لە خانەکاندا.

### نموونەی زیاتر

| أ | ب | ج |
|---|---|---|
| ٣,٢٥ × ١ = ٣,٢٥ | ٠,٤٧٨ × ١ = ٠,٤٧٨ | ٠,٠٠٠٩ × ١ = ٠,٠٠٠٩ |
| ٣,٢٥ × ١٠ = ٣٢,٥٠ | ٠,٤٧٨ × ١٠ = ٤,٧٨ | ٠,٠٠٠٩ × ١٠ = ٠,٠٠٩ |
| ٣,٢٥ × ١٠٠ = ٣٢٥,٠٠ | ٠,٤٧٨ × ١٠٠ = ٤٧,٨ | ٠,٠٠٠٩ × ١٠٠ = ٠,٠٩ |
| ٣,٢٥ × ١٠٠٠ = ٣ ٢٥٠,٠٠ | ٠,٤٧٨ × ١٠٠٠ = ٤٧٨ | ٠,٠٠٠٩ × ١٠٠٠ = ٠,٩ |

**ڕێنوێنی** چۆن شێواز بەکاردەهێنیت بۆ دانانی فاریزە لە ئەنجامی لێکدان لە نموونەی أ.

## ساغبکەوە

**١** بڕوانە شێوازی فاریزەکان لە ئەنجامی لێکدان لە نموونەکانی أ و ب و ج.
ڕێسایەك بنووسە بۆ دانانی فاریزە بەخێرایی لە وەڵامەکەتدا.

**ئەژمێرکردنی هزری بەکاربهێنە و تەواویبکە.**

**٢**
١ × ٠,٣ = ٠,٣
١٠ × ٠,٣ = ٣
١٠٠ × ٠,٣ = ■
١ ٠٠٠ × ٠,٣ = ■

**٣**
١ × ٢,٨٤٥ = ٢,٨٤٥
١٠ × ٢,٨٤٥ = ٢٨,٤٥
١٠٠ × ٢,٨٤٥ = ■
١ ٠٠٠ × ٢,٨٤٥ = ■

**٤**
١ × ٠,٣٤٥٩ = ٠,٣٤٥٩
١٠ × ٠,٣٤٥٩ = ■
١٠٠ × ٠,٣٤٥٩ = ٣٤,٥٩
١ ٠٠٠ × ٠,٣٤٥٩ = ٣٤٥,٩

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ئەژمێرکردنی هزری بەکاربهێنە، تەواویبکە.**

**٥**
١ × ٠,٠٠٥ = ٠,٠٠٥
١٠ × ٠,٠٠٥ = ■
١٠٠ × ٠,٠٠٥ = ٠,٥
١ ٠٠٠ × ٠,٠٠٥ = ٥

**٦**
١ × ٠,٣٤٥٦ = ٠,٣٤٥٦
١٠ × ٠,٣٤٥٦ = ٣,٤٥٦
١٠٠ × ٠,٣٤٥٦ = ■
١ ٠٠٠ × ٠,٣٤٥٦ = ■

**٧**
١ × ٠,٤٥ = ٠,٤٥
١٠ × ٠,٤٥ = ■
١٠٠ × ٠,٤٥ = ■
١ ٠٠٠ × ٠,٤٥ = ■

**هەر ژمارەیەك لە ١٠ و لە ١٠٠ و لە ١ ٠٠٠ بدە.**

**٨** ٠,٩ **٩** ٠,٥١ **١٠** ٠,٠٠٧ **١١** ٠,٠١٥

**١٢** ٠,٢١٧٨ **١٣** ٠,٢٥ **١٤** ٤٥,٦٩ **١٥** ١,٠٦٠٨

جەبر **بەهای س ئەژمێربکە**

**١٦** ١٠ × س = ٠,٠٩ **١٧** س × ٠,٠٨ = ٠,٨ **١٨** ١٠٠ × س = ٤,٥

**١٩** ١,٥ × س = ١٥ **٢٠** س × ١٠٠ = ١,٩ **٢١** س × ١ ٠٠٠ = ٣,١

**٢٢** نیوکیلۆگرام بریتیە لە ٠,٥ کیلۆگرام. بەهای ١٠٠ نیو کیلۆگرام، ١ ٠٠٠ نیوکیلۆگرام چەندە؟

**٢٣** کرمە لیقە لە خولەکێکدا ٨ سم دەبڕێت. بۆ بڕینی ماوەی ٨م چەند خولەکی پێویستە؟

**٢٤** **بنووسە** بۆچی ئەژمێرکردنی هزری لێکدانی ژمارەیەکی دەیی لە ١٠ و ١٠٠ و ١ ٠٠٠ ئاسان دەکات؟

**٢٥** کاتێ ٦,٧ لە ١٠ ٠٠٠ دەدەیت فاریزەکە لە کوێ دادەنێیت؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٦** ٨ × ١ ٤٥٦ **٢٧** ٢٣ × ٣٤٥

< یان > یان = لەناو ● دابنێ.

**٢٨** ٠,٨٩ ● ٠,٩٨ **٢٩** ٣,٩ ● ٣,٠٩

**٣٠** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە بەهای ن لەهاوکێشەکەدا ئەژمێربکە.

٩٠ = ن + ٣٢ + ٢٨

أ ن = ٢٠ ج ن = ٢٨

ب ن = ٣٠ د ن = ٣٢

وانەی ٤

# نواندنی لێکدان

## Multiply Representation

### پێداچوونەوەی خێرا

١ ٠,٤ + ٠,٤

٢ ٠,٦ + ٠,٦

٣ ٠,٧ + ٠,٧

٤ ٠,٤ + ٠,٤ + ٠,٤

٥ ٠,١ + ٠,١ + ٠,١

### فێربە

**چۆلەکە (پاساری) بچووک** چیا کۆمەڵەیەك چۆلەکەی بەزرنگەی بەخێوکرد. بارستاییان نزیکەی ٠,٢کگم بوو. ئەم کۆمەڵە ڕۆژانە پێویستیان بە نزیکەی نیوەی بارستایی خۆیان بە خواردن هەیە. چیا ڕۆژانە پێویستی بەچەند کگم خواردەنە بۆ چۆلەکەکانی؟

### نموونە

لێکبدە ٠,٢ × ٠,٥ ← بیربکەوە: نیوە یەکسانە بە ٠,٥

**هەنگاوی ١**

چوارگۆشەیەك بۆ ١٠ ئەستوونی یەکسان بەشبکە، ٥ لەو ئەستوونانە ڕەنگبکە بۆ نواندنی ٠,٥



**هەنگاوی ٢**

چوارگۆشەکە بۆ ١٠ ڕیزی یەکسان ڕەنگبکە بۆ دروستکردنی ١٠٠ بەشی یەکسان. دوو ڕیز بە ڕەنگی جیاواز لە ڕەنگەکانی تر بۆ نواندنی ٠,٢ ڕەنگبکە.



**هەنگاوی ٣**

ئەو ڕووبەرەی کە ڕەنگەکان تیایدا دەچنە ناویەکەوە. ئەنجامی لێکدانی ٠,٢ × ٠,٥ دەنوێنێ.



کەواتە، ٠,٢ × ٠,٥ = ٠,١٠

کەواتە، کۆمەڵ چۆلەکە بەزرنگەکان هەر ڕۆژێ پێویستیان بە ٠,١ کگم خواردن هەیە، بۆئەوەی بژین.

چۆلەکەی بەزرنگە دەتوانێ بۆ دواوە بفڕێ. بە دەوری خۆیدا وەك هەلیکۆپتەر بسوڕێنەوە دەتوانێ باڵەکانی بە شێوەی ٨ بسوڕێنێ.

**ڕێنوێنی** ئەو پەیوەندییە چیە کە ئەنجامی لێکدانی دوو ژمارەی دەیی هەریەکەیان بچوکتر لە ١ بە دوو ژمارەکەوە دەبەستێت.

### ساغبکەوە

١ ئایا ئەنجامی لێکدانی ٠,٢ × ٠,٤ بچووکترە لە ١ یان گەورەترە؟ وەڵامەکەت لێکبدەوە.

**ڕستەی لێکدان لەهەر نموونەیەك تەواوبکە**

٢

٠,٥ × ٠,٧ = س

٣

ك × ٠,٨ = ٠,٢٤

٤

٠,٣ × ٠,٥ = س

٥

٠,٩ × ن = ٠,٢٧

نموونەیەك پێكبهێنە و ئەنجامی لێكدان ئەژمێربكە.

٦ ٠,٥ × ٠,٩

٧ ٠,٧ × ٠,٤

٨ ٠,٣ × ٠,٣

٩ ٠,٤ × ٠,٨

ڕستەی لێكدان لەهەر نموونەیەك تەواوبكە.

١٠

٠,٤ × ٠,٦ = ن

١١

٠,٥ × ك = ٠,٢٥

١٢

س × ٠,٩ = ٠,١٨

١٣

٠,١ × ٠,٤ = ت

نموونەیەك پێكبهێنە و ئەنجامی لێكدان ئەژمێربكە.

١٤ ٠,٨ × ٠,٨

١٥ ٠,١ × ٠,٩

١٦ ٠,٦ × ٠,٢

١٧ ٠,٨ × ٠,٣

لێكبدە.

١٨ ٠,٧ × ٠,٨

١٩ ٠,٢ × ٠,٨

٢٠ ٠,٩ × ٠,٦

٢١ ٠,٦ × ٠,٧

٢٢ ٠,٥ × ٠,٦

٢٣ ٠,٨ × ٠,٩

٢٤ ٠,٥ × ٠,٤

٢٥ ٠,٣ × ٠,٦

جەبر بەهای س لە پرسیارەكانی ٢٦ تا ٢٩ ئەژمێربكە.

٢٦ س × ٠,٢ = ٠,١٤

٢٧ ٠,٦ × س = ٠,٤٨

٢٨ ٠,٩ × س =٠,٦٣

٢٩ س × ٠,٧ = ٠,٣٥

٣٠ درێژترین بۆق، بۆقی فولیاتە، كاتێك قاچەكانی درێژ دەكات، درێژیەكەی دەبێتە ٠,٨م، درێژی دەبێتە ٠,٥ی ئەو درێژییە كاتێك قاچەكانی درێژنەكات درێژی ئەو بۆقە چەندە كاتێك قاچەكانی درێژنەكات؟

٣١ ڕەنێو دوو قوتووی هەڵگرت كە بارستایی هەر یەكەیان ١,٢٩٨ كگم بوو. ٥ قوتووی تریش كە بارستایی هەریەكەیان ٠,٣٤٩ كگم، ڕەنێو چەند كیلۆگرام زیاتر یان كەمتر لە ١٠ كگم هەڵدەگرێت؟

٣٢ هەڵە لەكوێیە؟ هەوراز ووتی ٠,١ × ٠,٦ = ٠,٦ هەڵەكەی دیاریبكە و نموونەیەك بكێشە.

٣٣ كوللە نزیكەی ٠,٨م بازدەدات و كێچ ٠,٥ ی بازدانی كوللە بازدەدات. كێچ چەند بازدەدات؟



## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە

بۆ نزیكترین ملیۆن نزیكبكەوە

٣٤ ٤ ٠٩٩ ٩٩٩

٣٥ ١٦ ٣٩٩ ٩٩٩

ژمارەكان لە بچووكترینەوە بۆ گەورەترین ڕیزبكە.

٣٦ ٨٧ ٣١٤؛ ٨٧ ٤١٣؛ ٨١ ٣٤١

٣٧ ١٠٩ ٧٢١؛ ١٩٠ ٢٧١؛ ١٠٩ ٢٧١

٣٨ ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە ژمارە سێ و بیست لەسەر شێوەی ژمارەی دەیی وشێوەی كەرت كامەیە؟

أ ٣,٢ ؛ $\frac{٣٢}{١٠}$

ب ٢,٣ ؛ $\frac{٢٣}{١٠}$

ج ٣,١٢؛ $\frac{٣١٢}{١٠٠}$

د ٣,٠٢؛ $\frac{٣٠٢}{١٠٠}$

وانەی ٥

# دانانی فاریزە

## Place decimal point



**پێداچوونەوەی خێرا**

بۆ خانەی یەکان نزیکبکەوە.

1. ٣,٤
2. ٩٩,٢
3. ٠,٣٨
4. ٠,٦٨
5. ٥,٣

### فێربە

**بچووکترین مەمکدار** درێژی مشکە گرگنە لە لوتیەوە تا کۆتایی کلکی ٦,١سم ە. مشکی ماڵ بە ٢,٩ جار لە مشکە گرگنە درێژترە. درێژی مشکی ماڵ چەندە؟ بۆ بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە وەڵامەکە شیاوە. دەتوانی خەملاندن بەکاربهێنی بۆ دیاریکردنی شوێنی فاریزەکە لە ئەنجامی لێکدانی ژمارە دەییەکاندا.

**نموونە ١** لێکبدە ٢,٩ × ٦,١

**هەنگاوی ١**

ئەنجامی لێکدان بخەملێنە هەر ژمارەیەك نزیکبکەوە.

٦,١ × ٢,٩
↓ ↓
١٨ = ٦ × ٣

**هەنگاوی ٢**

لێکبدە وەك ئەوەی کە فاریزەکە نەبێ.

٦,١
٢,٩ ×
٥٤٩
١ ٢٢٠ +
١ ٧٦٩

**هەنگاوی ٣**

خەملاندن بۆ دانانی فاریزە لە ئەنجامی لێکداندا بەکاربهێنە

٦,١
٢,٩ ×
٥٤٩
١ ٢٢٠ +
١ ٧,٦٩

لەبەر ئەوەی خەملاندن بریتیە لە ١٨، فاریزەکە دابنێ تا ژمارەی تەواوەکە لە ئەنجامی لێکدانەکە لە دوو ڕەنووس پێکهاتبێ.

کەواتە درێژی مشکی ماڵ ١٦,٤٧ سم.

مشکی گرگنە بچووکترین مەمکدارە لە جیهاندا، دەتوانێ لەناو کەوچکێکی چێشتدا بخەوێت، بارستاییەکەی یەکسانە بە بارستایی تۆپێکی سەرمێز



### نموونەی زیاتر

**أ** لێکبدە ١١ × ٠,٤٨

١٠ × ٠,٥ = ٥ ⟵ بخەملێنە

٠,٤٨
١١ ×
٤٨
٤٨٠ +
٥,٢٨

لەبەرئەوەی خەملاندنەکە ٥. فاریزەکە دابنێ تا ژمارە تەواوەکە لەئەنجامی لێکدانەکە لەیەك ڕەنووس پێکهاتبێ.

**ب** لێکبدە ٠,٧٥ × ١,٢٥

٠,٨ × ١ = ٠,٨ أو ٠,٨٠ ⟵ بخەملێنە

١,٢٥
٠,٧٥ ×
٦٢٥
٨ ٧٥٠ +
٠,٩٣٧٥

لەبەرئەوەی خەملاندنەکە ٠,٨٠ فاریزەکە دابنێ تا ئەنجامی لێکدانەکە لە ١ بچووکتربێت.

## ژماردنی خانە دەیییەکان

دووبارە دەتوانیت فاریزەکە بەرچاو کردنی ئەم تێبینیە دابنێت. ژمارەی خانە دەیییەکان لە کۆلکەکاندا پێویستە یەکسان بێت بە ژمارەیان لە ئەنجامی لێکداندا.

**نموونە ٢** لێکبدە ٠,٧ × ٠,٢

**هەنگاوی ١**

لێکبدە وەك ئەوەی فاریزەکە نەبێ.

٠,٧
٠,٢ ×
١٤

**هەنگاوی ٢**

سەرجەمی خانە دەیییەکان لە دوو ژمارەکە دیاریبکە. فاریزەکە دابنێ، دوای ئەوەی کە خانە دەیییەکان دەژمێری، لەلای ڕاستی لە ئەنجامی لێکدانەوە دەستپێبکە.

٠,٧ ⟵ خانەیەکی دەیی لەم کۆلکەیەدا هەیە
٠,٢ × ⟵ خانەیەکی دەیی لەم کۆلکەیەدا هەیە
٠,١٤ ⟵ ١ + ١ واتە دوو خانەی دەیی لە ئەنجامی لێکداندا دەبێت.

لێکبدە ٠,٧ × ٠,٢ = ٠,١٤

## نموونەی زیاتر

**ج**

٢٣ ⟵ خانەی دەیی لەم کۆلکەیەدا سفرە
٠,٠٤ × ⟵ دوو خانەی دەیی لەم کۆلکەیە هەیە
٠,٩٢ ⟵ ٠ + ٢ واتە دوو خانەی دەیی لە ئەنجامی لێکداندا دەبێت.

**د**

٧,٥٢ ⟵ دوو خانەی دەیی لەم کۆلکەیەدا هەیە
٠,٢٣ × ⟵ دوو خانەی دەیی لەم کۆلکەیەدا هەیە
٢٢٥٦
١٥٠٤٠ +
١,٧٢٩٦ ⟵ ٢ + ٢ واتە ٤ خانەی دەیی لە ئەنجامی لێکداندا دەبێت.

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی خەملاندن یان سەرجەمی ژمارەی خانە دەیییەکان لە کۆلکەکاندا بەکاربهێنی بۆ دیارکردنی شوێنی فاریزکە لەئەنجامی لێکداندا.


مشکی ماڵ

## ساغبکەوە

**١** لە نموونەی د چۆن دڵنیا دەبیت کە وەڵامەکەت شیاوە.

**باشترین خەملاندن هەڵبژێرە، أ یان ب دەوربدە.**

**٢** ٠,٦ × ٣٤   أ ٢٤   ب ٢,٤

**٣** ٣,٩ × ٤,٢   أ ١٦   ب ١,٦

**هەر ڕاهێنانێك کۆپی بکە. پاشان فاریزە لە ئەنجامی لێکداندا دابنێ.**

**٤** ٢٩ × ٠,٧ = ٢٠٣

**٥** ٢,٩٨ × ٠,٧ = ٢٠٨٦

**٦** ١,٨ × ٠,٢ = ٣٦

**٧** ٠,٣٧ × ٠,٦٤ = ٢٣٦٨

**ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.**

**٨** ٩ × ٠,٧   **٩** ٠,٢ × ١٢   **١٠** ٩٥ × ٠,٦٤   **١١** ١,٢٥ × ٠,٥

**١٢** ٠,٩ × ٠,٤   **١٣** ٠,٣٧ × ٠,٦   **١٤** ٠,٢١١ × ١٨

**باشترین خەملاندن هەڵبژێرە، أ یان ب دەوربدە.**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٥ | ٠,٦ × ٢٢ | أ ١٢ | ب ١,٢ | | |
| ١٦ | ٤,٨ × ٢,٣ | أ ١٠ | ب ١,٠ | | |
| ١٧ | ٦ × ٠,٨٢ | أ ٠,٤٨ | ب ٤,٨ | | |
| ١٨ | ٠,٥ × ٤٢ | أ ٢٠ | ب ٢,٠ | | |

**هەر ڕاهێنانێك كۆپی بكە، پاشان فاریزەكە لە ئەنجامی لێكداندا دابنێ.**

١٩ $\begin{array}{r} ٣,٤ \\ ٥ \times \\ \hline ١٧٠ \end{array}$

٢٠ $\begin{array}{r} ٠,٥٨ \\ ٢ \times \\ \hline ١١٦ \end{array}$

٢١ $\begin{array}{r} ٥,٤٨ \\ ٠,٧٢٦ \times \\ \hline ٣٩٧\ ٨٤٨ \end{array}$

٢٢ $\begin{array}{r} ٢,٣٢ \\ ٤,٦٨ \times \\ \hline ١٠٨\ ٥٧٦ \end{array}$

**ئەنجامی لێكدان ئەژمێربكە. بخەملێنە بۆ ساغكردنەوە.**

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٢٣ | ١٤ × ٠,٣ | ٢٤ | ١٢٠٦ × ٠,٥ | ٢٥ | ٤,٥ × ٦,٨ | ٢٦ | ٣,٨ × ٧,٢٥ |
| ٢٧ | ٢,٧ × ٥,١ | ٢٨ | ٧,٢ × ١٢,٩٢ | ٢٩ | ٠,٢١ × ١٩ | ٣٠ | ٤,٦٢ × ٣٨,٨ |
| ٣١ | ٠,٨ × ٠,٧ | ٣٢ | ٣,١ × ٦,٩ | ٣٣ | ٠,٩ × ٠,١٢ | ٣٤ | ٨٢ × ٠,٣٢٥ |
| ٣٥ | ٠,٤ × ٠,٦٨ | ٣٦ | ٠,٩ × ٢,٣٦ | ٣٧ | ٠,٩١٨ × ٠,٣ | ٣٨ | ٠,٠٧ × ٩,٢ |
| ٣٩ | ٠,٧٥ × ٠,٢٥ | ٤٠ | ٠,٢٠١ × ٠,٨ | ٤١ | ٥,٦ × ٢,٧ | ٤٢ | ٦,٢ × ٤٣,٣ |
| ٤٣ | ٠,٨ × ٢٤,٣٧ | ٤٤ | ٣,٢ × ٠,٨٤٨١ | ٤٥ | ٠,٤٢×٩,٧٤٨ | ٤٦ | ٠,١٨١ × ٤٣٦,٣ |

٤٧ كام ئەنجامی لێكدان ٦ خانەی دەیی لەخۆ دەگرێت؟

أ ٠,٠٤٥٦ × ٠,١٢    ب ٠,٠٤٥٦ × ١,٢    ج ٠,٠٤٥٦ × ١٢

٤٨ كام ئەنجامی لێكدان ٥ خانە دەیەكی لەخۆدەگرێت؟

أ ١,٠٧٨ × ٠,٢٨٣    ب ١,٠٧٨ × ٢,٨٣    ج ١,٠٧٨ × ٢٨,٣

٤٩ **بنووسە** چۆن خەملاندن بۆ دانانی فاریزە لە ئەنجامی لێكداندا بەكاردەهێنی. نموونەی لەسەر بێنەوە.

**بەكارهێنانی پێدراوەكان** وێنە ڕوونكردنەوەییەكە بۆ شیكاری پرسیاری ٥٠ تا ٥٣ بەكاربهێنە.




٥٠ ژمارەی چۆلەكە چەندی زیاترە لەژمارەی كەروێشك لەكێڵگەكەدا؟

٥١ ٠,٢٥ی ژمارەی كام گیانەوەر یەكسانە بە ژمارەی بزنەكان لە كێڵگەكەدا؟

٥٢ كام جۆر لە گیانەوەران كەمترین ژمارەیان هەیە لە كێڵگەكەدا؟

٥٣ ژمارەی مریشك چەندی زیاترە لە سەرجەمی ژمارەی مانگا و بزن لە كێڵگەكەدا؟

**٥٤** ٤ قوتابی ٦ پاکەت قەڵەمیان بەیەکسانی بەسەر خۆیان دابەشکرد، هەر پاکەتەی هەمان ژمارەی قەڵەمی تێدابوو. هەر قوتابیەك ٦ قەلەمی بەرکەوت. ژمارەی قەڵەمەکان لە هەر پاکەتێکدا چەندبوو؟

**٥٥** کێچ ماوەی ١٣٠ ئەوەندەی دریژی خۆی باز دەدات، ئەگەر درێژییەکەی ٠,١٦سم بێت. ئەوا ماوەیە چەندە کە بازدەدات؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٥٦** ٢ ٥٧٤ + ٦ ٩٠٩ + ٧ ٩٨١

**٥٧** ٨٧ + س = ١٤٧شیکاربکە

**٥٨** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ژمارەی دەیی هەشت بەش لە هەزار کامەیە.

أ ٧,٠٤٩٢ ج ٠,٠٠٨

ب ٧,٠٤٩٢ د ٠,٠٠٠٨

**٥٩** هاوکێشە شیکاربکە. سیفەتی بەکارهاتوو بۆ ١٧ × س = ٠ دیاربکە

**٦٠** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە لە کام ژمارەدا بەهای ڕەنووسی ٤ بچووکترینیانە؟

أ ٧,٠٤٩٢ ج ٧,٤٩٠٢

ب ٧,٢٠٤٩ د ٧,٩٢٠٤

## شیکاری پرسیارەکان دەروازەیەك لەسەر خوێندنەوە
### Link Up to Reading

**پوختەی بکە** واتە هەمان زانیاری بە کورتکراوەیی بنووسیتەوە. بە مەرجێك زانیارییە زۆر گرنگەکان بەبیر بخەیتەوە. سازان ٥ ڕۆژ لەهەفتەیەکدا بەتێکڕای ٨ کاتژمێر لە هەر ڕۆژێکدا لەسەر کۆمپیوتەر کار دەکات. دەزانی کە ١٥٠ دینار بۆهەر (کیلۆوات کاتژمێر) (ك و ك) لە بری بەکارهێنانی کارەبا دەدات. سازان پێویستە چەند پارە بدات ئەگەر ٤ هەفتە لەسەر کۆمپیوتەر کاربکات؟

| پوختەکە | شیکارەکە |
|---|---|
| بەکارهێنانی لەکاتژمێرێکدا | ٠,١ |
| ڕۆژانە ٨ کاتژمێر | ٨ × ٠,١ = ٠,٨ |
| ٥ ڕۆژ لە هەفتەدا | ٥ × ٠,٨ = ٤ |
| ٤ هەفتە | ٤ × ٤ = ١٦ |
| تێچوون لە ٤ هەفتەدا | ١٦ × ١٥٠ = ٢٤ ٠٠٠ |

کەواتە، ٢٤ ٠٠٠ دینار دەدات.

کارەبای بەکارهاتوو لەکاتژمێرێکدا (ك. وات/ك)

| جۆر | سەرفکردن |
|---|---|
| کۆمپیوتەر | ٠,١ |
| گڵۆپی ئاسایی | ٠,١ |
| قژ ووشك کەرەوە | ١,٥ |
| تەلەفزیۆن | ٠,٢ |
| ساردکەرەوە | ٠,٦٥ |
| گیزەر | ٤,٥ |

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆشیکاری پرسیاری ١، ٢ بەکاربێنە.



**١** خێزانی سازان ڕۆژانە ٣ کاتژمێر گیزەر بەکاردەهێنن، لە هەفتەیەدا پارەی کارەباکەی چەندە؟ وەڵامەکەت بۆ نزیکترین دینار نزیکبکەوە.

**٢** گڵۆپی گازی ٠,٤ (ك و ك) لەهەر کاتژمێرێك بەکاردێنێت، تێچوونی گڵۆپێکی ئاسایی چەند زیاتر لە گڵۆپێکی گازی بۆ ماوەی ١٠ کاتژمێر.

# سفر لە لێکداندا

## Zeros in Multiplication



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٠,٤ × ١
٢ ٠,٤ × ٢
٣ ٠,٤ × ١٠
٤ ٠,٤ × ٢٠
٥ ٠,٥ × ١٢٥

### فێربـــــە

هەندێجار لە ئەنجامی لێکداندا یان یەکێك لەکۆلکەکانی چەند سفرێك لەخۆدەگرێ.

**مێروولە** جۆرێك لە مێروولەی کارکەر هەیە زۆر زۆر بچووکە. بارستایی هەر مێروولەیەك لەوانە ٠,٠٠٤گرامە، ئەم مێروولەیە دەتوانێ ٥ ئەوەندی بارستایی خۆی هەڵبگرێ لە ڕۆیشتندا؟ بارستایی ئەوەی هەڵیدەگرێت چەند گرامە؟

٠,٠٠٤ ⟵ لەبەرئەوەی لەم کۆلکەیەدا ٣ خانەی دەیی هەیە بۆیە
٥ × پێویستی بە ٣ خانەی دەیی هەیە لە ئەنجامی لێکداندا.
٠,٠٢٠
سفرێك لە لای چەپی ئەنجامی لێکداندا بنووسە بۆ دانانی فاریزەکە.

کەواتە، مێروولەی کارکەر دەتوانێ ٠,٠٢٠ واتە ٠,٠٢گرام هەڵبگرێت.

### نموونەکان

**أ** ١٨ × ٠,٠٠٣ لێکبدە

١٨
٠,٠٠٣ ×
٠,٠٥٤

لەبەرئەوەی پێویستی بە ٣ خانەی دەیی لەئەنجامی لێکداندا هەیە سفر لەو خانەیەدا دابینێ.

**ب** ٠,٠٧ × ٠,٠٩ لێکبدە

٠,٠٧
٠,٠٩ ×
٠,٠٠٦٣

لەبەرئەوەی پێویستی بە ٤ خانەی دەیی لە ئەنجامی لێکداندا هەیە. سفر لەهەر یەکێك لەو دوو خانەیەدا دابنێ.

**ج** ٩,٢٧ × ٠,٠٠٢ لێکبدە

٩,٢٧
٠,٠٠٢ ×
٠,٠١٨٥٤

لەبەرئەوەی پێویستی بە ٥ خانەی دەیی لەئەنجامی لێکداندا هەیە. ٠ لەو خانەیەدا دابینێ.

**د** دەتوانی ئامێری بژمێر بۆ لێکدانی ژمارە دەییەکان بەکاربهێنیت.

٠,٣٤ × ٠,٠٦ بدۆزەوە.

٦ ٠ ٠ ٠ X ٤ ٣ ٠ ٠ Enter =

٠,٠٦x٠,٣٤ =
٠,٠٢٠٤

• ئەنجامی لێکدانی بۆ نزیکترین بەش لەسەد لە نموونەی أ چەندە؟

**لەبیرت نەچێ** لەلای چەپی ئەنجامی لێکداندا پێویستیت بە سفری زیادە هەیە تا ژمارەی خانە دەییەکان یەکسان بێت بەژمارەی خانە دەییەکان لە کۆلکەکاندا.

## ساغبکەوە

**١** بڵێ، چ کاتێك سفرەکان لە ئەنجامی لێکداندا زیاددەکەیت بۆ دانانی فاریزەکە.

**لێکبدە.**

**٢** ٠,٠٠٣ × ٨ **٣** ٠,٤ × ٠,٠٤ **٤** ٩ × ٠,٠١٨ **٥** ٠,٠٠٠٦ × ٦

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە.**

**٦** ٠,٠٠٧ × ٩ **٧** ٠,٠٢ × ٢ **٨** ٠,٠١٦ × ٠,٥ **٩** ٠,٠٣ × ٠,٨

**١٠** ٠,٠٠٦ × ٩ **١١** ٠,٠٨ × ٠,٠٢ **١٢** ٠,٠٠٤ × ٢٤ **١٣** ٠,١٢ × ٠,٠٩

**١٤** ٥٤,٠٧ × ٠,٠٤ **١٥** ٠,٠٠٧ × ٨ **١٦** ٠,٠٣٢ × ١٧ **١٧** ٠,٠١٤ × ٠,٠٦

**ئەنجامی لێکدان ئەژمێربکە. بۆ نزیکترین بەش لەسەد نزیکبکەوە.**

**١٨** ٠,٠٨ × ٠,٨٩ **١٩** ٠,٠٥ × ٠,٩٥ **٢٠** ٠,٠٥ × ٣,٠٩ **٢١** ٠,٠٦ × ٥,٠٥

**< یان > = لە شوێنی ● دابنێ.**

**٢٢** ٩ × ٠,٠٠٨ ● ٨ × ٠,٠٠٩ **٢٣** ٠,٠٢٥ × ٣ ● ٠,٠٢ × ٣,٠١

**٢٤** **پرسیارێك بنووسە** ئەم پێدراوانە لەخۆ بگرێت. دووری نێوان ماڵی جوامێر و دەرمانخانەیەك ٠,٧٨کم. وە ماوەی نێوان دەرمانخانەکە و شوێنی کاری باوکی ١,٠٣ کم و نێوان ماڵەکەی و قوتابخانەکەی ٠,٣٦کم.

**٢٥** دایکی ڕەوەز ٢٨ کگم زەردەلوی بۆ دروستکردنی مرەبا کڕی. دایکی ڕەوەز بارستایی زەردەلوەکەی جارانی ١,٠٧ کرد، بۆئەوەی بارستایی مرەباکە دوای کوڵاندن و شەکر تێکردن بزانێ. بارستایی ئەو مرەبایەی کە بەدەستی دەهێنێ چەندی لە ٥٠ کگم کەمترە؟

**٢٦** مزگەوتێك ٣,٨کم لەماڵی سەرکۆوە دوورە، ئەو ماوەیەی سەرکۆ ڕۆژانە بۆ بەجێگەیاندنی نوێژی بەیانی و نوێژی ئێوارە دەیبڕێ چەندە؟

**٢٧** **بنووسە** ئەو هەنگاوانەی کە بۆ لێکدانی ٠,٠٥ × ٠,٠٦ بەکاریدەهێنی بنووسە.

**٢٨** **پرسیار چییە؟** چالاك دوو پاکەت چکلێتی کڕی بارستایی یەکەمیان ٣,٠٢ کگم و ئەویتریان ٠,٩٩ کگم. وەڵام ٤,٠١ کگم.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٩** ٩ ١٢٦ ٥٤٣ − ٣ ٩٧٢ ٦٤٥

**٣٠** ١٩ ٢٨٢ ٤٤٣ + ٧٢٣ ٤٥١

**٣١** ٤٥٦ − ٣٠٩ **٣٢** ١٣ × ١,٢٥

**٣٣** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — ژمارە ٢,٢١٧٨ بۆخانەی ڕەنووسی شین نزیکبکەوە.

أ ٢ ب ٢,٢ ج ٢,٢٢ د ٢,٢١٨

وانەی
٧

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان

## بڕیاردان
## Problem Solving Skills: Taking Decision



**پێداچوونەوەی خێرا**

> یان < یان = لەشوێنی ⬤ دابنێ.

١ ٣٦,٥٢ ⬤ ٣٦,٢٥

٢ ٤٩ ⬤ ٥١

٣ ٧,٨١ ⬤ ٧,٨٤

٤ ٠,٩٨ ⬤ ٠,٨٩

٥ ١,٥ × ٤ ⬤ ١,٢٥ × ٦

تێبگە | پلاندابنێ | شیکاربکە | ساغبکەوە

**دیاری ڕەنگا و ڕەنگ** زێڕینگەرێك ملوانكە و بازنە بە بەکارهێنانی مووروو لە شەش ڕەنگی جیاواز دروست دەکات. ئەگەر ویستت ملوانکەیەك بە دیاری بۆ خوشکت بکڕی و سێ جۆر ملوانکە لە دوکانەکەدا هەبێ هـ، ن، د. پێش ئەوەی بڕیاربدەی کام جۆریان بکڕیت پێویستە بیر لەچەند شتێك بکەیتەوە.

| ژمارەی مورووەکان | | | |
|---|---|---|---|
| ڕەنگەکان | ملوانکە هـ | ملوانکە ن | ملوانکە د |
| سوور | ٠ | ٤ | ٤ |
| شین | ١٢ | ٨ | ٨ |
| سەوز | ١٢ | ٦ | ٨ |
| زەرد | ١٢ | ١٠ | ١٢ |
| پرتەقالی | ٠ | ٤ | ١ |
| وەنەوشەیی | ١٢ | ٨ | ٨ |

**زانیاریە هاتووەکان لە دوو خشتەکە بەکاربهێنە بۆ ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەیتەوە.**

أ درێژی مۆروەکان لە هەریەکە لە ملوانکەکاندا چەندە؟ کامیان درێژترە ؟

ب ئەگەر زانیت خوشکت پێکهاتەکانی ڕەنگی (سور، پرتەقاڵی، وەنەوشەیی)، کام ملوانکە هەڵدەبژێری؟

ج ئەگەر زانیت خوشکت بە ژمارە تاکەکان گەشبینە کام ملوانکە هەڵدەبژێریت؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

د دوکاندارەکە هەر سەنتیمەترێك لە ملوانکەی هـ بە ١ ١٥٠ دینار و ملوانکەی ن بە ١ ٢٠٠ دینار و ملوانکەی د بە ١ ٢٥٠ دینار دەفرۆشێت ئەگەر بتەوێت گرانترین دیاری بکڕی کام ملوانکە هەڵدەبژێری، وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

| درێژی مورووەکان | |
|---|---|
| ڕەنگ | درێژی (سم) |
| سوور | ١,٢ |
| شین | ٠,٥ |
| سەوز | ٠,٧ |
| زەرد | ٠,٤ |
| پرتەقالی | ١,٣ |
| وەنەوشەیی | ٠,٦ |

**باسبکە**

- چەند لایەنی تر دەتوانی ڕەچاوی بکەیت پێش بڕیاردان لە کڕینی هەر ملوانکەیەك کە هەڵیدەبژێری. باسبکە.

**لەبیرت نەچێ** بەراورد لەنێوان ڕاستیەکان و پێدراوەکان بکە بۆئەوەی بڕیاربدەی.



## ◄ ڕاهێنان و شیكاری پرسیارەكان

**پێدراوەكان بەكاربهێنە** بۆ شیكاری پرسیاری ١ و ٢

**١** ئەگەرویستت ١٢ بەستە تەلی دڕكاوی جووتانە و ١٠ بەستەش لە تەلی لوسی جووتانە بكڕیت لەكام دوكانی أ و ب ئەوەی دەتەوێ بیكڕی درێژترە؟

| خەسڵەتی تەلەكان | | | |
|---|---|---|---|
| جۆری تەل | دوكانی أ | دوكانی ب | دوكانی ج |
| دڕكاوی | درێژی دوو بەستە ٠,٧٥ كم | درێژی یەك بەستە ٠,٣٣ كم | درێژی چوار بەستە ١,٤٠ كم |
| لوس | درێژی یەك بەستە ٠,٤٧ كم | درێژی سێ بەستە ١,٥٠ كم | درێژی یەك بەستە ٠,٥١ كم |
| دڕكاوی جووتانە | درێژی سێ بەستە ١,٨٩ كم | درێژی یەك بەستە ٠,٧٥ كم | درێژی دوو بەستە ١,٣٦ كم |
| لوسی جووتانە | درێژی یەك بەستە ٠,٨٩ كم | درێژی دوو بەستە ١,٨٠ كم | درێژی یەك بەستە ٠٩٢ كم |

**٢** ئەگەر ویستت ٤ بەستە تەلی دڕكاوی و ٣ بەستە تەلی لوس لە دوكانێك بكڕی، لەكام دوكان ئەوەی دەتەوێ بیكڕی كورتترە؟



أ دوكانی أ

ب دوكانی ب

ج دوكانی ج

د درێژیەكان لەهەرسێ دوكان وەكیەكن

**٣** ٢م لە بەرامبەر كڕینی ١٠م لە دوكانی ج بەخۆڕایی وەردەگری. ٤ بەستە تەلی دڕكاویت لە دوكانی ج كڕی. چەند مەتر بەخۆڕایی وەردەگری؟

أ ١٨٤ م    ج ٥٤٤ م

ب ٢٨٠ م    د ٦٨٠ م

## جێبەجێكردنە جیاوازەكان

**٤** تێكڕای ژمارەی ئەو ئۆتۆمبیلانەی كە ڕۆژانە پردی ژاراوە لە قەڵادزێ دەبڕن ٤٥٠ ئۆتۆمبیلە، فریاد ووتی ژمارەی ئەو ئۆتۆمبیلانەی كە ساڵانە بەسەر ئەو پردەدا دەڕۆن ٢٥٠ ١٦٤ ئۆتۆمبیلە. بەڵام فەرمان ووتی ٧٥٠ ٤٢ ئۆتۆمبیلە كامیان وەڵامەكەیان شیاوە؟ ئەمە لێكبدەوە.

**٥** **پرسیارێك بنووسە** پێویستیت بە بڕیاردانە پێدراوە هاتووەكانی ناو خشتەكەی سەرەوە بەكاربهێنە.

**٦** وێنەی فودانەكان «میزڵدان» بەكاربهێنە. فودانەكانی هیوا و هێدی بەتەنیشت یەكەوەن فودانەی هاوار لەفودانەی هێدی گەورەترە. كێ فودانەی خەتداری هەیە؟

بەشی ٥

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

| |
|---|
| یەکسانە equal |
| دەییەک tenth |
| بەشێك لەسەد hundredth |
| بەشێك لەهەزار thousandth |
| خەملاندن estimate |
| چەندجارە multiply |
| کۆلکە factor |

دەربڕینی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

١ ٠,١ ___؟___ دەنوێنێ.

٢ ٠,٠١ ___؟___ دەنوێنێ.

٣ دەتوانی ___؟___ بەکاربهێنی بۆ دیاریکردنی تاچەند وەڵامەکە شیاوە.

٤ ___؟___ بریتییە لە ئەنجامی لێکدانی ژمارەیەکی دراو لە ژمارەیەکی سروشتی.

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

هەر ژمارەیەك لە ١٠، لە ١٠٠، لە ١ ٠٠٠ بدە.

٥ ٠,٣ ٦ ٠,٦٤ ٧ ٠,٠٠٢ ٨ ٠,٠٢٢٥

هەر پرسیارێك کۆپی بکە. فاریزەی دەیی لەهەریەك لە ئەنجامی لێکدانڎا دابنێ.

٩ ٢٥ = ٠,٥ × ٠,٥ ١٠ ٥ ٣٤٤ = ٣,٣٤ × ١,٦ ١١ ١١ ٨٥٦ = ٠,٧٨ × ٠,١٥٢

لێکبدە.

١٢ ١ ٢٣٩ × ٦ ١٣ ٨٨ × ١ ٢٦٥ ١٤ ٧ × ٨٦ ٦٨٥

لێکبدە. بخەمڵێنە بۆ ساغکردنەوە.

١٥ ٠,٨ × ٦,٥٠ ١٦ ٢٢ × ٢,٨٥ ١٧ ٠,٦ × ٤,١٥ ١٨ ٢,٣ × ٩,٨

١٩ ٠,٩٦ × ٥ ٢٠ ٧,٦٢ × ٠,٠٨ ٢١ ٠,٩ × ٠,٠٩ ٢٢ ٣,٩٦ × ٢٨

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

٢٣ ئاکۆ دەڵێ ئەنجامی لێکدانی ٧ ٦٥٤ ٨٢ لە ٢٦٩ دەکاتە ٢٢٢ ٣٤١ ١٤٣ ئایا ئەم وەڵامە شیاوە؟ لێکبیدەوە.

٢٤ لازۆ دەڵێ ئەنجامی لێکدانی ٦ ٧٠٤ لە ٤٣ دەکاتە ٤٦ ٩٢٨. ئایا وەڵامەکە شیاوە؟ لێکبیدەوە.

٢٥ ئەنجامی لێکدانی ٦٠ لە ٩٠٠ سێ سفری تێدایە. لەئەنجامی لێکدانی ٦٠ لە ٩ ٠٠٠ ٠٠٠ چەند سفری تێدایە؟

٢٦ راز ماوەی ٢٤,٦٥کم لە ڕۆژێکدا دەبڕێ لە ١٢ ڕۆژدا چەند کیلۆمەتر دەبڕێت؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
# Standardized Test Prep




**بەدوای ووشە گرنگەکاندا بگەڕێ**
لە پرسیاری ١ خەملاندن ووشەیەکی گرنگە.
نزیککردنەوەی کۆلکەکان بۆ خەملاندن
دەگەینێت جگەلە وەلامێکی تەواو.

**وەلامی ڕاست بۆ شیکاری پرسیاری ١ تا ٨ هەلبژێرە.**

**١** کام خەملاندن بۆ ٦٢٥ × ٢٩ شیاوترە؟

أ ١٨٠٠٠ ج ١٨٠٠
ب ١٨٥٠ د ١٢٠٠

**٢** کام سیفەت بەکارهاتووە لە ١,٢٥ × ٠ = ٠

أ سیفەتی پێکەوەبەستن
ب سیفەتی سفر
ج سیفەتی ئالوگۆڕ
د سیفەتی بەشینەوە

**٣** نووسین بە پیتی بۆ ژمارە ١,٢٩ کامەیە؟

أ سەد و بیست و نۆ
ب سەد و بیست و نۆ دەییەك
ج یەك و بیست و نۆ دەییەك
د یەك و بیست و نۆ بەش لەسەد

**٤** ساكار ١٦ پاكەت مورووی كڕی هەر پاكەتێك ٢٥ مورووی تێدابوو ساكار چەند مورووی كڕیوە؟

أ ٤٠ ج ١٧٥
ب ١٥٠ د ٤٠٠

**٥** محمد بە خێرایی ٩كم/ك دەڕوات. ماوەی پێشبڕكێكەی بە ٢,٩١ك بڕی، نزیككراوەی ماوەكەی كە بڕیویەتی بۆ نزیكترین دەیی چەندە؟

أ ٢,٦ كم ج ٢٦,٢ كم
ب ٢٦ كم د ٢٦١,٩ كم

**٦** لە ئەنجامی لێكدانی ٠,٠٠٣ × ٠,٠٦ ژمارەی خانە دەییەكان كامایە؟ .

أ ٢ ب ٤ ج ٥ د تیایدا نیە

**خشتەكە بۆ شیكاری پرسیاری ٧ تا ٨ بەكاربهێنە.**

| خێرایی مێرووەكان | |
|---|---|
| مێروو | خێرایی (م/چ) |
| هەنگ | ٣,١٥ |
| زەردەواڵە | ٥,٨٨ |
| شاهەنگ | ٧,٨٣ |
| مێش | ٣,٩٦ |

**٧** كام ڕیز كردن لە بچووكەوە بۆ گەورەیە.

أ ٣,١٥؛ ٣,٩٦؛ ٥,٨٨؛ ٧,٨٣
ب ٣,١٥؛ ٣,٩٦؛ ٧,٨٣؛ ٥,٨٨
ج ٧,٨٣؛ ٣,٩٦؛ ٥,٨٨؛ ٣,١٥
د ٧,٨٣؛ ٥,٨٨؛ ٣,٩٦؛ ٣,١٥

**٨** زەردەواڵەیەك لە ٦ چركەدا چەند مەتر دەبڕێ؟

أ ٤٦,٩٨ م ج ٢٣,٧٦ م
ب ٣٥,٢٨ م د ١٨,٩ م

## ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know



**٩** هەنگێك و مێشێك لە خاڵێكەوە بۆ ماوەی ٢١ چركە بەرەو ئاراستەیەك فڕین، یەكێكیان بە چەند پێش ئەوەی تریان دەكەوێت؟ ڕوونیبكەوە.

**١٠** ڕوونبكەوە. چۆن ژمارەیەكی سروشتی لە ١٠ ٠٠٠ دەدەی، و ژمارەیەكی دەیی لە ١٠ ٠٠٠؟ بۆهەر یەكیان نموونەیەك بهێنەوە.

بەشی ٦

# دابەشکردنی ژمارە سروشتییەکان

## Divide the Natural Numbers

لەسەرەتایی مێژووە مورو بەکارهاتووە لە گۆڕینەوە و نەخش و جوانکاری.

**پرسیارێك بۆ شیکار**

خشتەکە ژمارەی مورووەکان لە پێوانەی جیاوازدا نیشان دەدات بۆ دروستکردنی بازنێك لە ٧ پارچەی یەکسان لە درێژیدا. بۆ هەر پێوانەیەك لە مورو، ژمارەی مورووەکان لەهەر پارچەیەك وە درێژی هەر پارچەیەك دیاریبکە.

ژمارەی مورووەکان لە بازنێکی ٧ پارچەییدا

| پێوانەی مورووەکان | ژمارەی مورووەکان |
|---|---|
| ٢ ملم | ٩١ |
| ٣ ملم | ٥٦ |
| ٤ ملم | ٤٢ |
| ٦ ملم | ٢٨ |
| ٨ ملم | ٢١ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know

ئەم لاپەرەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیارییانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان

دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

- بەشکراو dividend
- بەشدراو divisor
- کۆلکە factor
- ئەنجامی دابەشکردن «بەرکەوت» quotient
- ماوە remainder
- پێچەوانە inverse
- بەها ئەژمێربکە calculate value

١ ئەو ژمارەی کەدابەشکراو بەسەریا دابەشدەکرێ پێی دەووترێت ؟ .

٢ کاتێك ؟ کە بڕی گۆڕاوەکە بە ژمارەیەك بگۆڕێتەوە و پاشان کردارەکە جێبەجێبکە.

٣ ؟ ئەو ژمارەیە کە لە کرداری دابەشکردندا دابەشیدەکەین.

٤ لەپرسیارەکەی لای چەپدا ؟ بریتییە لە ٧ و ؟ بریتییە لە ٣.

$\begin{array}{r} ٧ \text{ م}٣ \\ ٥\overline{)٣٨} \end{array}$

## دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی

دابەشبکە.

٥ $٣\overline{)٨٥}$ ٦ $٧\overline{)٩٣}$ ٧ $٢\overline{)٦١}$ ٨ $٦\overline{)٩٢}$ ٩ $٦\overline{)٢٩}$

١٠ $٧\overline{)٨٤}$ ١١ $٢\overline{)٥٨}$ ١٢ $٦\overline{)٤٤}$ ١٣ $٨\overline{)٩٧}$ ١٤ $٥\overline{)٥٢}$

١٥ ٣١٢ ÷ ٢ ١٦ ٤٥ ÷ ٥ ١٧ ٢٦٤ ÷ ٨ ١٨ ٨٩٧ ÷ ٧ ١٩ ٩٦٨٤ ÷ ٤

## دابەشکردن بەسەر ١٠ دا

دابەشبکە.

٢٠ ٦٧٠ ÷ ١٠ ٢١ ٤٠٠ ÷ ١٠ ٢٢ ٦٧٠٠ ÷ ١٠ ٢٣ ٧٠٠ ÷ ١٠

٢٤ $١٠\overline{)٦٠}$ ٢٥ $١٠\overline{)٦٠٠}$ ٢٦ $١٠\overline{)٨٥٠}$ ٢٧ $١٠\overline{)٨٥٥٠}$

## دڵنیابوون لە دابەشکردنەکە

دڵنیابوون لە دابەشکردن بە بەکارهێنانی لێکدان

٢٨ $\begin{array}{r} ٢٣ \\ ٢\overline{)٤٦} \end{array}$ ٢٩ $\begin{array}{r} ١١ \text{ م}٥ \\ ٨\overline{)٩٣} \end{array}$ ٣٠ $\begin{array}{r} ١٢٤ \text{ م}٦ \\ ٧\overline{)٨٧٤} \end{array}$ ٣١ $\begin{array}{r} ٦٢ \\ ٦\overline{)٣٧٢} \end{array}$

٣٢ $\begin{array}{r} ١٣ \\ ٧\overline{)٩١} \end{array}$ ٣٣ $\begin{array}{r} ٣١ \text{ م}٧ \\ ٨\overline{)٢٥٥} \end{array}$ ٣٤ $\begin{array}{r} ١٨٨ \text{ م}٢ \\ ٤\overline{)٧٥٤} \end{array}$ ٣٥ $\begin{array}{r} ١٧ \\ ٥\overline{)٨٥} \end{array}$

وانەی ١

# دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی یەك ڕەنووسی

## Divide dy 1-digit number



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ $٧٠ \times ٤$

٢ $٤٠٠ \times ٢$ ٣ $٩٠ \times ٨$

٤ $٩٠ \times ٦$ ٥ $٣٠٠ \times ٣$



گەشتیارە ئاسمانیەکان لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٦٩ تا ١٩٧٢ دا ٣٨٢کگم بەرد و گڵیان لەسەر ڕووی مانگ هێنایەوە.

### فێربە

**لەسەر مانگ** هێزی ڕاکێشانی مانگ بە ٦ جار لە هێزی ڕاکێشانی زەوی کەمترە. تەنێك لەسەر مانگ $\frac{1}{6}$ ی کێشەکەیەتی لەسەر زەوی، ئەگەر بەردێك کێشەکەی لەسەر زەوی ١٠٢ نیوتن بێت. ئایا کێشەکەی لەسەر مانگ چەندە؟

### ڕێگای یەکەم

بۆ دیارکردنی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا خەمڵاندن بەکاربێنە. دابەشبکە ١٠٢÷٦

**هەنگاوی ١**

بخەمڵێنە

بیربکەوە

٦⟌٦٠ = ١٠ یان ٦⟌١٢٠ = ٢٠

٦⟌١٠٢ کەواتە، ڕەنووسی یەکەم لەخانەی دەیان دابنێ.

**هەنگاوی ٢**

١٠ دەیی دابەشبکە

دابەشبکە ٦⟌١٠ = ١

لێکبدە $١ \times ٦$

لێدەربکە $١٠ - ٦$

بەراوردبکە $٤ < ٦$

```
   ١
٦⟌١٠٢
 - ٦
 ----
   ٤
```

**هەنگاوی ٣**

٢ یەکان دابگرە

دابەشبکە ٦⟌٤٢

لێکبدە $٧ \times ٦$

لێدەربکە $٤٢ - ٤٢$

بەراوردبکە $٠ < ٦$

```
   ١٧
٦⟌١٠٢
 - ٦↓
 ----
   ٤٢
 - ٤٢
 ----
    ٠
```

کەواتە کێشی بەردەکە لەسەر ڕووی مانگ دەکاتە ١٧ نیوتن

### ڕێگای دووەم

بەهای خانەیی بۆ دانانی ڕەنووسی یەکەم بەکاربهێنە. دابەشبکە $٨٩٣ \div ٩$

**هەنگاوی ١**

بڕوانە سەدان

٩⟌٨٩٣ $٨ < ٩$، کەواتە بڕوانە دەیان.

٩⟌٨٩٣ $٨٩ > ٩$

٨٩ دەیی بەکاربهێنە ڕەنووسی یەکەم لە خانەی دەیان دابنێ

**هەنگاوی ٢**

٨٩ دەیی دابەشبکە

دابەشبکە

لێکبدە

لێدەربکە

بەراوردبکە

```
   ٩
٩⟌٨٩٣
 - ٨١
 ----
   ٨
```

**هەنگاوی ٣**

٣ یەکان دابگرە

٨٣ یەکی دابەشبکە

دابەشبکە

لێکبدە

لێدەربکە

بەراوردبکە

```
   ٩٩
٩⟌٨٩٣
 - ٨١↓
 -----
   ٨٣
 - ٨١
 -----
    ٢
```

وەڵام ٩٩، ماوە ٢

**ساغبکەوە√**

ئەنجامی دابەشکردن لە بەشدراو بدە پاشان ماوەکەی بۆ زیادبکە.

```
   ٩٩
 ×  ٩
 ----
  ٨٩١
 +  ٢
 ----
  ٨٩٣
```

## ساغبکەوە

**١** ڕوونیبکەرەوە چۆن دەتوانی بەبێ ئەنجامدانی کرداری دابەشکردن، دیاریبکەیت کە ئەنجامی دابەشکردن لە ٥٣٩ ÷ ٦ لەدوو یان سێ ڕەنووس پێکدێت.

**خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردنەکەدا دیاریبکە.**

**٢** ٩⟌١١٧ **٣** ٥⟌٢١٣ **٤** ٤⟌٤٧٢ **٥** ٦⟌٩١٧ **٦** ٩⟌٥٢٦

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**خانەی ڕەنووسی یەکەم لەئەنجامی دابەشکردنەکەدا دیاریبکە.**

**٧** ٨⟌٥٠٤ **٨** ٢⟌٧٢٤ **٩** ٤⟌١٨٣ **١٠** ٧⟌٨٥٧ **١١** ٦⟌١٧٦

**دابەشبکە.**

**١٢** ٢⟌٤٠٨ **١٣** ٧⟌٤٨٩ **١٤** ٥⟌٥١٦ **١٥** ٤⟌٨٤٤ **١٦** ٨⟌٢٤٦

**١٧** ٨⟌١١٣ **١٨** ٩⟌٩١٢ **١٩** ٣⟌٦٠٧ **٢٠** ٢⟌٥٢٦ **٢١** ٤⟌٢٢٣

**٢٢** ٣٤٨ ÷ ٨ **٢٣** ٩٠٥ ÷ ٥ **٢٤** ١٢٤ ÷ ٦ **٢٥** ٤١٤ ÷ ٥ **٢٦** ٨٠٧ ÷ ٤

جەبر **بەهای ن بدۆزەوە.**

**٢٧** ٣٥٧ ÷ ٣ = ن **٢٨** ن ÷ ٥ = ٣٥ م٤ **٢٩** ن ÷ ٧ = ٤٧ م٣ **٣٠** ٢٦٩ ÷ ن = ١٣٤ م١

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٣١ و ٣٢ بەکاربێنە.

**٣١** تیمی گەشتێکی ئاسمانی کە پێکهاتووە لە ٧ گەشتیار، چەند ژەمێکی خواردن لەهەر جۆرێك بۆ هەر گەشتیارێك ئامادەکراوە؟ خشتەکە کۆپی بکە و تەواوی بکە.

**٣٢** بارستایی خواردەمەنی ڕێگا پێدراو بۆهەر گەشتیارێکی تیمەکە دەگاتە ٣,٨ کیلۆ لە ڕۆژێکدا. جیاوازی نێوان بارستایی تیمێکی ٧ کەسی لە ٦ ڕۆژ و ٦ کەسی لە ٧ ڕۆژدا چەندە؟

| ژەمە ئاسمانییەکان | | |
|---|---|---|
| جۆر | ژمارەی ژەمەکان | ژمارەی ژەمەکان بۆهەر یەکێك |
| شلەمەنی خەست کە ئاوی تێبکرێت. | ٢٠٣ | |
| خواردەمەنی نەکوڵاو | ١٧٥ | |
| خواردەمەنی خەست کە ئاوی تێبکرێت | ٢٣٨ | |

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٣٣** ٦,٨ + ٠,٨

**٣٤** ٦,١٦ − ٣,٤٧

**٣٥** ژمارەیەك بۆ شێوازەکە زیادبکە:
٢٤، ٣٦، ٤٨، ٦٠، .... شێوازەکە باسبکە.

**٣٦** ٤ × ن ئەژمێربکە کە ن = ١٦,٥

**٣٧** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە بخەمڵێنە، بەبێ ئەنجامدانی لێکدان، کام ئەنجامی لێکدان بچووکترینە.

أ ٠,٩ × ١٠  ج ٠,٩ × ٠,١
ب ٠,٩ × ١  د ٠,٩ × ٠,٠١

وانەی ٢

# دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی

## Divide by 2 - Digit numbers



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ١٠ × ٤٣

٢ ٩ × ٢٥

٣ ٣٠ × ٢٠

٤ ١٢ × ٥٠

٥ ٨٠ × ٥٠

**فێربـــــە**

**کاتژمێر و نیوێك لە کاتژمێرێکدا** کارگەیەکی دروستکردنی کاتژمێر لە وولاتی چین ٧٥٥ کاتژمێری لەماوەی ٢٣ ڕۆژدا دروستکرد، ناوەندی بەرهەم هێنان بۆ کاتژمێر لە ڕۆژێکدا چەندە؟

### نموونە

دابەشبکە ٧٥٥ ÷ ٢٣ ٢٣⟌٧٥٥

**هەنگاوی ١**

**بخەمڵێنە**، بۆدانانی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا، **بیربکەوە**

٢٥⟌٧٥٠ = ٣٠ یان ٢٠⟌٨٠٠ = ٤٠

کەواتە، ڕەنووسی یەکەم لە خانەی دەیان دابنێ. ٢٣⟌٧٥٥

**هەنگاوی ٢**

٧٥ دەیی دابەشبکە

دابەشبکە ٢٣⟌٧٥ ← ٣

لێکبدە ٢٣ × ٣ ← ٦٩ −

لێدەربکە ٧٥ − ٦٩ ← ٦

بەراوردبکە ٦ < ٢٣

**هەنگاوی ٣**

٥ یەکان دابگرە، ٦٥ یەکان دابەشبکە

دابەشبکە ٢٣⟌٦٥ ← ٣٢

لێکبدە ٢٣ × ٣ ← ٦٩ −، ٦٥

لێدەربکە ٦٥ − ٤٦ ← ٤٦ −

بەراوردبکە ١٩ < ٢٣ ← ١٩

کەواتە، ناوەندە بەرهەم هێنانی کاتژمێرەکان لەنێوان ٣٢، ٣٣ کاتژمێرە لە ڕۆژێکدا.



● **ڕوونیبکە** چۆن لێکدان بەکاردێنی بۆساغکردنەوەی ٧٥٥ ÷ ٢٣= ٣٢ ماوە ١٩

**لەبیرت نەچێ** بۆ دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی. یەکەمجار بخەمڵێنە بۆ دانانی ڕەنووسی یەکەم. پاشان هەنگاوەکانی دابەشکردن پەیڕەو بکە. دابەشبکە لێکبدە، لێدەربکە، بەراوردبکە. هەنگاوەکان دووبارە بکەوە تا ماوەکە دەبێتە سفر یان کەمتر لە بەشدراو.

## نموونەی زیاتر

**أ**

دابەشبکە

```
      ٩٥
١٦⟌١ ٥٣٥
  ١ ٤٤ −
  ─────
     ٩٥
     ٨٠ −
    ───
     ١٥
```

ساغبکەوە √

```
     ٩٥
     ١٦ ×
  ─────
    ٥٧٠
    ٩٥٠
  ─────
  ١ ٥٢٠
     ١٥ +
  ─────
√ ١ ٥٣٥
```

**ب**

دابەشبکە

```
      ١ ٣٠٣
٢٤⟌٣١ ٢٩٤
    ٢٤    −
   ────
     ٧٢
     ٧٢   −
   ────
     ٠٩
      ٠   −
   ────
      ٩٤
      ٧٢ −
   ────
      ٢٢
```

ساغبکەوە √

```
   ١ ٣٠٣
      ٢٤ ×
  ───────
   ٥ ٢١٢
  ٢٦ ٠٦٠ +
  ───────
  ٣١ ٢٧٢
      ٢٢ +
  ───────
√ ٣١ ٢٩٤
```

• لە نموونەی ب، لە ئەنجامی دابەشکردنەکە سفرەکە چی دەگەیێنێ؟

## شێوازەکان لە دابەشکردندا

**ج**

٨ ÷ ٢ = ٤ ⟵ ڕاستی بنەڕەتی

٨٠ ÷ ٢٠ = ٤

٨٠٠ ÷ ٢٠ = ٤٠

٨ ٠٠٠ ÷ ٢٠ = ٤٠٠

٨٠ ٠٠٠ ÷ ٢٠ = ٤ ٠٠٠

**د**

١٢ ÷ ٦ = ٢ ⟵ ڕاستی بنەڕەتی

١٢٠ ÷ ٦٠ = ٢

١ ٢٠٠ ÷ ٦٠ = ٢٠

١٢ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ٢٠٠

١٢٠ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ٢ ٠٠٠

**هـ**

٣٠ ÷ ٦ = ٥ ⟵ ڕاستی بنەڕەتی

٣٠٠ ÷ ٦٠ = ٥

٣ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ٥٠

٣٠ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ٥٠٠

٣٠٠ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ٥ ٠٠٠

**لەبیرت نەچێ** ڕاستیە بنەڕەتیەکان و شێوازەکان بۆ دابەشکردن بەسەر چەندجارەکانی **١٠** بەکاربهێنە.

## ساغبکـــەوە

**١** ڕوونبکەوە بۆچی خەملاندن بۆ دابەشکردن بەکاردەهێنی؟

**خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردندا دیاریبکە.**

**٢** ٣٦⟌٢٠٩    **٣** ١٤⟌١ ٦٢٤    **٤** ٥٣⟌٢ ٣٦٩    **٥** ٤٧⟌٧ ٣٩٥

**٦** ٨٩⟌٨ ٩٦٩    **٧** ٤٣⟌٢٠٥    **٨** ٣٨⟌٧ ٢٦٨    **٩** ٢٣⟌٢٤ ٦١٣

**دابەشبکە بە لێکدان ساغیبکەوە.**

**١٠** ٨٣١ ÷ ٣٨    **١١** ٢ ٨١٦ ÷ ٥٦    **١٢** ٣ ٩٧٤ ÷ ٢٣    **١٣** ٦٩٤ ÷ ٨١

**١٤** ٤٢⟌٣٦٥    **١٥** ٣٨⟌٤ ٠٣١    **١٦** ٧٤⟌٣ ٥٦٨    **١٧** ٥٤⟌٣٤ ٠٧٨

**ئەژمێرکردنی هزری بۆ تەواوکردن بەکاربهێنە. ئەو ڕاستییە بنەڕەتیانەی بەکاریدەهێنیت بینووسە.**

**١٨**
٣٢٠ ÷ ٤٠ = ٨
٣ ٢٠٠ ÷ ٤٠ = ٨٠
٣٢ ٠٠٠ ÷ ٤٠ = ■

**١٩**
٤٢٠ ÷ ٦٠ = ٧
٤ ٢٠٠ ÷ ٦٠ = ٧٠
٤٢ ٠٠٠ ÷ ٦٠ = ■

**٢٠**
٤٠٠ ÷ ٥٠ = ■
٤ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = ٨٠
٤٠ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = ٨٠٠

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردنەکەدا دیاریبکە.

**٢١** ٤٧⟌٣١٠  **٢٢** ٢٥⟌٣ ٢٠٥  **٢٣** ٦٣⟌١ ٨٢٤  **٢٤** ٧١⟌٩ ٥٤٦

**٢٥** ٤٢⟌٤٢ ٧٨٥  **٢٦** ٦٨⟌٥٤ ٣٣٠  **٢٧** ٢١⟌٤٥٨  **٢٨** ٣٤⟌٣ ٨٩٤

دابەشبکە: بە کرداری لێکدان ساغییبکەوە.

**٢٩** ٩٤٢ ÷ ٤٩  **٣٠** ٥ ٦٩٠ ÷ ٧٨  **٣١** ٤٥٨ ÷ ٤٥  **٣٢** ١٠ ٦٧٥ ÷ ١١

**٣٣** ٤ ٣٦٩ ÷ ٧٤  **٣٤** ١٢ ٣٦٢ ÷ ٣٥  **٣٥** ٨ ١٤٩ ÷ ٤١  **٣٦** ٣٠ ٣٦٢ ÷ ٦٢

ئەژمێرکردنی هزری بۆ تەواوکردن بەکاربهێنە. ئەو ڕاستیە بنەڕەتیەی بەکاریدەهێنیت بنووسە.

**٣٧** ٩٠ ÷ ٣٠ = ▢  **٣٨** ١٠٠ ÷ ٥٠ = ٢  **٣٩** ٤٥٠ ÷ ٩٠ = ٥

٩٠٠ ÷ ٣٠ = ٣٠  ١ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = ٢٠  ٤ ٥٠٠ ÷ ٩٠ = ▢

٩ ٠٠٠ ÷ ٣٠ = ٣٠٠  ١٠ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = ▢  ٤٥ ٠٠٠ ÷ ٩٠ = ▢

هەر کردارێکی ساغکردنەوە بە پرسیاری دابەشکردنی گونجاو ببەستەوە.

**٤٠** ساغبکەوە (٦٦ × ١٤) + ٦٠ = ٩٨٤  أ ٧ ٩٨٢ ÷ ٦٩ = ١١٥ماوە ٤٧

**٤١** ساغبکەوە (٨٢ × ١١٨) + ٧١ = ٩ ٧٤٧  ب ٩٨٤ ÷ ٦٦ = ١٤ ماوە ٦٠

**٤٢** ساغبکەوە (٩١ × ٢١٢) + ٩ = ١٩ ٣٠١  ج ٩ ٧٤٧ ÷ ٨٢ = ١١٨ماوە ٧١

**٤٣** ساغبکەوە (٦٩ × ١١٥) + ٤٧ = ٧ ٩٨٢  د ١٩ ٣٠١ ÷ ٩١ = ٢١٢ ماوە ٩

جەبر ژمارەی نادیار بدۆزەوە.

**٤٤** ١ ٢٨٨ ÷ ٢٣ = ▢ ٥  **٤٥** ٣ ٥٨٠ ÷ (▢ × ١٠) = ٨٩ ب٢٠

ڕاستیە بنەڕەتیەکان و شێوازەکان بۆ دۆزینەوەی بەهای ن بەکاربهێنە.

**٤٦** ٩٠ ÷ ٣ = ن  **٤٧** ١٦٠ ÷ ٤٠ = ن  **٤٨** ٣٦ ٠٠٠ ÷ ٩٠ = ن  **٤٩** ن ÷ ٨٠ = ٣٠

**٥٠** **هەڵە لە کوێدایە؟** هەڵە لەو کاغەزەی لە وێنەکەدایە، ئایا لە شیکارەکەدایە یان لە ساغکردنەوە؟ لێکیبدەوە هەڵەکەش ڕاست بکەوە.

| | |
|---|---|
| ١٥ | ساغبکەوە√ |
| ١٨⟌٢٨٢ | |
| ١٨ − | ١٥ |
| ١٠٢ | ١٨ × |
| ٩٠ − | ١٢٠ |
| ١٢ | ١٥٠ + |
| | ٢٧٠ |
| وەڵام ١٨ ماوە ١٢ | |

**٥١** **هەڵە لەکوێدایە؟** جوتیار وتی ئەنجامی ٢٠٠ ٠٠٠ ÷ ٤٠ چوار سفری تێدایە، هەڵەی جوتیار دەربخە و وەڵامی ڕاست بنووسە.

**٥٢** **مانای ژمارە** دوو ژمارە ئەنجامی دابەشکردنەکەیان ٧، و سەرجەمیان ٦٤. ئەو دوو ژمارەیە کامانەن؟

**٥٣** **ڕێنوێنی** گەورەترین ماوە لەکاتی دابەشکردنی ژمارەیەك بەسەر ٤٥ دا کامەیە؟ ئەمە ڕوونبکەوە.

**٥٤** نرخی بلیتی شانۆ ٩ هەزار دینار بۆ مامۆستایەك و ٦ هەزار دیناریش بۆ قوتابیەك. بەرپرسی قوتابخانە ١١ بلیتی بۆ مامۆستایان کڕی و بڕی ١٥٣ هەزار دیناری دا، ئایا لەو پارەیە چەند بلیتی بۆ قوتابیان کڕیوە؟

٥٥ ٢ کچ و ٤ کوڕ زەوییەکیان بۆ بەجێما کە ڕووبەرەکەی ٦٢٥ ١ مەتر چوارگۆشە بوو. بەشی هەر کچ و هەر کوڕێك چەندە؟ بۆ زانین میراتەکە بەپێی یاسای ئاینی ئیسلام دابەشدەکرێت.

٥٦ لەمانگی ڕەمەزاندا کوێخا ٠٩٠ ١کیلۆگرام گەنمی بەسەر نەداراندا دابەشکرد. دوو لەوان هەریەکەیان ٥٠کیلۆگرام دانێ. ماوەکەی بەسەر ١١ نەداری تردا دابەشکرد هەریەکەیان چەندی بەرکەوتووە؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٥٧ تا ٥٩ بەکاربهێنە.

٥٧ ناوەندە ژمارەی خاڵەکان کە تیپی سیروان لەهەموو یاریەکاندا تۆماری کردووە بخەمڵێنە؟

٥٨ **پرسیای چییە؟** تیپی ئاراس ٢١٠ خاڵ کەمتری تۆمارکردووە.

٥٩ **ڕێنوێنی** کام لەم دوو تیپە، ئاسۆ یان سەنحاریب ناوەندی ژمارەی خاڵەکانی لە یاریەکدا گەورەترە؟

**ئەنجامەکانی یانەی تۆپی باسکە**

| تیپ | ژمارەی یاری | ژمارەی خاڵ |
|---|---|---|
| سیروان | ١٢ | ٨١٦ |
| ئاسۆ | ١١ | ٧٢٠ |
| سەنحاریب | ٩ | ٦٢٥ |
| ئاراس | ٨ | ٤١٥ |

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**سیفەتی لێکدانی بەکارهاتوو لە پرسیارەکانی ٦٠ تا ٦٣ دیاریکە.**

٦٠ $٢ \times (٣ \times ٥) = (٢ \times ٣) \times ٥$

٦١ $٢ \times ٧ = ٧ \times ٢$

٦٢ $٨ \times ١ = ٨$

٦٣ $٢ \times ٠ = ٠$

٦٤  لە ئەنجامی ئەم دابەشکردنە چەند سفر هەیە؟ $٧٢ ٠٠٠ \div ٩٠$

أ سفر نیە    ج ٣ سفر

ب ٢ سفر    د ٤ سفر

# شیکاری پرسیارەکان
# گۆشەی ڕووناکبیران




### نزیککردنەوە

**کەرەستەکان:** کاغەز، قەڵەم، دوو خشتەکی ڕەنووسکراو لە ٠ بۆ ٥ ، وە سێ خشتەکی ڕەنووسکراو لە ٤ بۆ ٩.

**بۆئەوەی یاری بکەین !**

- یاریزانێك خشتەکەکان هەڵدەدا وئەو ڕەنووسانەی دەستی دەکەوێ بەکاریان دێنێ بۆ نوسینی پرسیارێکی دابەشکردنی ژمارەیەکی سێ ڕەنووسی بەسەر ژمارەیەکی دوو ڕەنووسی.
- یاریزانی دووەم لەئەنجامی دابەشکردنەکە و ماوەکە خۆی دڵنیا دەکا. ئەگەر وەڵامەکە ڕاستبوو ئەوا ماوەکە تۆماردەکا، وەئەگەر هەڵەبوو ئەوا تۆماری ناکا.
- دوو یاریزانەکە یاریەکە تەواودەکەن و ڕۆڵەکانیان دەگۆڕنەوە و پرسیارەکانی دابەشکردن و تۆمارکردنی ماوە ڕاستەکە دەنووسنەوە. ئەو یاریزانەی زۆرترین ژمارەی وەڵامی ڕاستە سەرکەوتووە.

وانەی ٣

# سفر لە دابەشکردندا

## Zeros in Division



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ $٣ \overline{)٦٠}$

٢ $٢ \overline{)٨٠}$

٣ $٤ \overline{)٨٠}$

٤ $١٠ \overline{)١٠٠}$

٥ $٩ \overline{)٩٠}$

### فێربە

چالاك ٤ دوكانی هەیە، ٤٣٢ کاتژمێری دیواری کڕی و بە یەکسانی بەسەر دوکانەکانیدا دابەشکرد ئایا چەند کاتژمێری لەهەر دوکانێکدا داناوە؟

**نموونە**

دابەشبکە ٤٣٢ ÷ ٤ $٤ \overline{)٤٣٢}$

بخەمڵێنە ٤٤٠ ÷ ٤ = ١١٠

**هەنگاوی ١**

٤ سەدان دابەشبکە

بیربکەوە: دەتوانرێ ٤ سەدان دابەش ٤ بکرێت کەواتە ڕەنووسی یەکەم لە خانەی سەدان لە ئەنجامی دابەشکردن دابنێ.

```
   ١
٤)٤٣٢
 -٤
  ٠
```

**هەنگاوی ٢**

دەیان دابگرە. ٣ دەیان دابەشبکە

بیربکەوە: لەبەرئەوەی ٤ > ٣

• لەئەنجامی دابەشکردن دابنێ.

```
   ١٠
٤)٤٣٢      دابەشبکە
 -٤↓       لێکبدە
  ٠٣
 - ٠       لێدەربکە
   ٣       بەراوردبکە ٣ < ٤
```

**هەنگاوی ٣**

یەکان دابگرە. ٣٢ یەکان دابەشبکە

بیربکەوە: ٤ × ن = ٣٢

```
   ١٠٨     دابەشبکە
٤)٤٣٢      لێکبدە
 -٤↓
  ٠٣       لێدەربکە
 - ٠       بەراوردبکە ٠ < ٤
   ٣٢
 - ٣٢
    ٠
```

لەبەرئەوەی ١٠٨ نزیکە لەخەمڵاندنی ١١٠، وەڵامەکە شیاوە، کەواتە ١٠٨ کاتژمێری دیواری لە هەردوکانێکدا داناوە.

• ئەگەر نووسینی سفرت لە ئەنجامی دابەشکردنەکە لەبیربچێ وەڵامەکە چۆن دەبێ؟

**لەبیرت نەچێ** سفر لە ئەنجامی دابەشکردندا دابنێ ئەگەر بەشدراو گەورەتر بێت لە ڕەنووسی بەشکراو لەم هەنگاوەدا.




### ساغبکەوە

١ ڕوونیبکەوە کەی بڕیار دەدەی سفر لە ئەنجامی دابەشکردندا دابنێی؟ نموونە بۆ ئەمە بهێنەوە.

دابەشبکە. بخەمڵێنە بۆ ساغکردنەوە

**٢** ٥⟌٢٥٠ **٣** ٧⟌٧٣ **٤** ٤٠⟌٨٠١٠ **٥** ٣٧⟌٤ ٨٠١

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

دابەشبکە. بخەمڵێنە بۆ ساغکردنەوە.

**٦** ٦⟌٦٢٤ **٧** ٥⟌٥٢٥ **٨** ٨⟌٢٥٥ **٩** ٣⟌٣٠٩

**١٠** ١٧⟌٦٩٥ **١١** ٦٢⟌٦٣٥ **١٢** ٤٠⟌٨ ١٦٠ **١٣** ١٢⟌٩٠٨

**١٤** ٤٣⟌٧٥٩ **١٥** ٧٣⟌٥ ٨٤١ **١٦** ٣٧⟌٣ ٣٦٣ **١٧** ٨٢⟌٨ ٩٢٧

**١٨** ٦١ ÷ ٢ **١٩** ٥٢٨ ÷ ٩ **٢٠** ٧٤٤ ÷ ٨ **٢١** ٦٠٦ ÷ ٣

**٢٢** ١ ٢٢٠ ÷ ٤٠ **٢٣** ٥ ٠٤٦ ÷ ٥٠ **٢٤** ٨ ٢٤١ ÷ ٨١ **٢٥** ٦ ٣١٥ ÷ ٦٣

جەبر بەهای ن ئەژمێربکە.

**٢٦** ٣٠٥ ÷ ٥ = ن **٢٧** ن ÷ ٨ = ١١٠ م٧ **٢٨** ن ÷ ٧ = ١٠١ م٣ **٢٩** ٢٠٩ ÷ ن = ١٠٤ م١

جەبر هەموو خشتەکە تەواوبکە، و ڕیسای دابەشکردنەکە بنووسە.

**٣٠**

| ناوەوە، ن | ٤٩ | ١٠٧ | ٢٣٩ | ٥٦٤ |
|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ٧ | ١٥ماوە ٢ | | |

**٣١**

| ناوەوە، ن | ٨٣ | | ٤٠٤ | ٤١٢ |
|---|---|---|---|---|
| دەرەوە | ٢٠ماوە٣ | ٢٤ ماوە٣ | ١٠١ | |

**٣٢** بۆ دورینی دەستەسرێك، پارچەیەك قوماش درێژیەکەی ٢٥سم بێت بەشدەکات ژمارەی دەستەسرەکان کە بتوانرێ لە پارچە قوماشێك درێژیەکەی ٥م بێت بدروێ چەندە؟

**٣٣** وەزارەتی کشتوکاڵی هەرێمی کوردستان ٢ ٥٣٥ نەمام سێوی بەیەکسانی بەسەر ١٥ گوندا دابەشکرد. هەر گوندەی چەند نەمامی بەرکەوتووە؟

**٣٤** ڕێنوێنی ئایا ٠ لە ئەنجامی دابەشکردنی ٨٨٤ ÷ ٤ دا هەیە؟ چۆن دەزانی بەبێ ئەوەی دابەشکردن بکەی؟

**٣٥** خێرخوازێك ٣ ٥٣٦ ٠٠٠ دیناری بەیەکسانی بە خشیە سەر ١٧ خێزانی هەژار. هەر خێزانێك چەندی بەرکەوتووە؟

**٣٦** هەڵە لەکوێدایە؟ ئاریان ووتی ٦ ÷ ٦ دەکاتە ١. کەواتە ٦٠٦ ÷ ٦ = ١١. هەڵەکە دیار بکە و ڕاستەکە بنووسە.

**٣٧** باوکی شانۆ ١٢ کورسی کڕی، ٢٠٠ هەزار دیناری دایە بازرگانەکە ٨٠ هەزار دیناری بۆ گێڕایەوە، نرخی یەك کورسی چەندە؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٣٨**
```
  ١٠٠
– ٤٧
```

**٣٩**
```
  ٥٠٠
– ١٧٦
```

**٤٠** ٢ ٠٠٠ – ٧٨٦

**٤١** ژمارە ٢٤٦,٩٧٥ بەدرێژی بنووسە.

**٤٢** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە ژمارەیەکی دەیی هاوتا بۆژمارە ٠,٠٤ هەڵبژێرە.

أ ٤,٠ ب ٠,٤ ج ٠,٠٤٠ د ٠,٠٠٤

وانەی ٤

# ڕاهێنان لەسەر دابەشکردن
## Practice on Division



**پێداچوونەوەی خێرا**

١) ٤ + ٣٤٥
٢) ١١ + ٧٨١
٣) ٩ + ٦٢٨
٤) ٣٨ + ٦ ٧٦٠
٥) ١٢ + ١ ٢٣٢



قامیشی حەیزران بە ژمەیکی سەرەکی لە خواردنی ورچی پاندا دادەنرێت، ورچی پاندا ڕۆژانە زیاتر لە ١٨ کیلۆ لە قامیشی تەڕ دەخوات.

### فێربە

چەند دەتوانی بخۆ ورچی پاندا لە ساڵێکدا ٤ ٦٢٠ کیلۆ قامیشی حەیزران و گەڵاکانی دەخوات ناوەندەی خواردنەکەی لە مانگێکدا چەندە؟

### نموونە

دابەشبکە ٤ ٦٢٠ ÷ ١٢ — ١٢⟌٤ ٦٢٠

**هەنگاوی ١**

بخەمڵێنە

بیربکەوە

١٢⟌٤ ٨٠٠ = ٤٠٠

١٢⟌٤ ٦٢٠

کەواتە، ڕەنووسی یەکەم لە خانەی سەدان دابنێ.

**هەنگاوی ٢**

٤٦ سەد دابەشبکە.

خەملاندنی یەکەم بەکاربهێنە.

```
      ٣
١٢⟌٤ ٦٢٠
   ٣ ٦ −
   ١ ٠
```

**هەنگاوی ٣**

٢ دەیان دابگرە. ١٠٢ دەیان دابەشبکە.

```
      ٣ ٨
١٢⟌٤ ٦٢٠
   ٣ ٦ −
   ١ ٠٢
     ٩٦ −
      ٦
```

**هەنگاوی ٤**

سفر یەکان دابگرە، ٦٠ یەکی دابەشبکە.

```
      ٣ ٨ ٥
١٢⟌٤ ٦٢٠
   ٣ ٦ −
   ١ ٠٢
     ٩٦ −
      ٦٠
      ٦٠ −
       ٠
```

وەڵام ٣٨٥

کەواتە ورچی پاندا مانگانە ٣٨٥ کگم لە قامیشی حەیزران و گەڵاکانی دەخوات.

### نموونەی زیاتر

**أ**

```
      ٢٤
٣٥⟌٨٤٣
   ٧٠ −
   ١٤٣
   ١٤٠ −
     ٣
```

وەڵام ٢٤ ماوە ٣

ساغبکەوە √

```
    ٢٤
    ٣٥ ×
   ١٢٠
   ٧٢٠ +
   ٨٤٠
     ٣ +
 √ ٨٤٣
```

**ب**

```
      ٦١
٤٢⟌٢٥٧٩
   ٢٥٢ −
    ٥٩
    ٤٢ −
    ١٧
```

وەڵام ٦١ ماوە ١٧

ساغبکەوە √

```
     ٦١
     ٤٢ ×
    ١٢٢
  ٢ ٤٤٠ +
  ٢ ٥٦٢
     ١٧ +
√ ٢ ٥٧٩
```

دەتوانیت ئامێری بژمێر بۆ جێبەجێکردنی دابەشکردنەکە بەکاربهێنیت؟




٢٥٧٩ ÷ ٤٢ =
٦١ م ١٧

## ◀ ساغبکەوە

**١** **ڕێنوێنی** ڕوونیبکەوە چۆن ژمارەیەکی ٤ ڕەنووسی بەسەر ژمارەیەکی ٣ ڕەنووسی دابەشدەکەی؟

**دابەشبکە و ساغبکەوە**

**٢** ٨٥١ ÷ ١٥　　**٣** ٩٣ ÷ ١٤　　**٤** ١ ٢٤٢ ÷ ٤٨

**٥** ٤٢⟌٢٣ ٨٩٨　　**٦** ٦١⟌٣٦ ١٨٢　　**٧** ٢٩⟌١ ٠٧٣

## ◀ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**دابەشبکە**

**٨** ٤٠٢ ÷ ٦٥　　**٩** ٤ ١٦١ ÷ ١٩　　**١٠** ٤ ٥٩١ ÷ ٣٧　　**١١** ٨٩ ÷ ٢٣

**١٢** ٧١⟌٧ ١٧١　　**١٣** ٣٣⟌١ ٨٧٧　　**١٤** ٥١⟌٤ ٠٩٥　　**١٥** ٩٢⟌٤٦ ٢٣٥

**١٦** ٩١⟌٥ ٣٩٦　　**١٧** ٦٩⟌٢ ١٠٩　　**١٨** ٤٨⟌٢٤ ٩١٦　　**١٩** ٤٢⟌٢٣ ٩١١

**٢٠** ٢٥⟌٤٢٤ ٨٦٧　　**٢١** ٣٢⟌٣٠٦ ٤٥٢　　**٢٢** ٤١⟌٨ ٢٦٩ ٠٧٩　　**٢٣** ٣٧⟌٦ ٣١٣ ٦٤٢

**جەبر** **ژمارەی نادیار لە پرسیارەکانی ٢٤ تا ٢٩ دیاربکە.**

**٢٤** ٤ ■ ٤ ÷ ٢٣ = ١٨　　**٢٥** ١ ٠٦٥ ÷ ■١ = ١٥　　**٢٦** ٢٢ ■٧ ÷ ٩٩ = ٧٨

**٢٧** ١٢ ٠٨٤ ÷ ٧٦ = ■١٥　　**٢٨** (١ ١٨٨ − ١٨) ÷ ٩٠ = ■١　　**٢٩** ١ ٨٦٠ ÷ (■ × ١٥) = ٦٢

**٣٠** لە ڕۆژی جیهانی بۆ پاراستنی گیانداران ٣١ ٠٠٠ کەس سەردانی سایتێکی ئەنتەرنێتیان کرد تایبەت بوو بە ورچی پاندا، ناوەندەی ژمارەی میوانەکانی ئەم سایتە لە کاتژمێرێکدا چەندە؟



**٣١** **مانای ژمارە** بچووکترین ژمارەی چوار ڕەنووسی کامەیە دابەشی ژمارە ٢٠ بکرێت و ماوەکەی ٥ بمێنێتەوە.

**٣٢** ورچی پاندا لە ساڵێکدا نزیکە ٥ ١١٠ کاتژمێر چالاکە. هەر جارێك ماوەی پشوودانی لەنێوان ٢ تا ٤ کاتژمێرە. ورچی پاندا چەند کاتژمێر لە ڕۆژێکدا چالاکە؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**سیفەتی کۆکردنەوە لەپرسیاری ٣٣، ٣٤ دیاربکە**

**٣٣** ١٠ + ٧ = ٧ + ١٠

**٣٤** (٤ + ٢) + ٣ = ٤ + (٢ + ٣)

**٣٥** ٢٤,١٨ − ١٦,٠٩　　**٣٦** ١٦,٨٢ + ٧,٤٨

**٣٧** ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە — بارستایی سەلکێك پەنیر ٢,٧٥ کگم چێشتخانەیەك ١٨ سەلك پەنیری کڕی، بارستایی گشتی سەلکەکان چەندیان لە ٥٠کگم کەمترە؟

أ ٠,٠٣ کگم　　ج ٠,٦٠ کگم

ب ٠,٥٠ کگم　　د ١,٥٠ کگم

وانەی ٥



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٢٩ ÷ ٨ ٢ ٣٩ ÷ ٩

٣ ٦٠ ÷ ٧ ٤ ٢٢ ÷ ٥

٥ ٢٥ ÷ ٦

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان

## لێکدانەوەی ماوە

## Problem Solving Skills

### Explanation the Remainder

تێبگە | پلاندابنێ | شیکاربکە | ساغبکەوە



دیاربکە ماوە چۆن بۆ شیکاری پرسیارە هاتووەکانی خوارەوە بەکار هاتووە. پرسیارەکە دیاریدەکا کەی دەتوانی ماوەکە فەرامۆش بکەی و ئەنجامی دابەشکردنەکە بۆ ئەو ژمارەیەی کەراستەوخۆ لەدوایەوە دێ نزیکبکەیتەوە، و کەی ماوە وەك بەشێك لە وەڵامەکە بەکاردێ.

**لەبیرت نەچێ** کاتێك پرسیارێکی دابەشکردن شیکاردەکەی ئەوا مانای ماوەکە پەیوەندی دەبێ بەوەی پرسیارەکە لەخۆی گرتووە.

### نموونە

**أ** ١ ٨٥٣ دێدەوان لە ئاهەنگی کۆتایی دێدەوانی بەشداربوون، هەر شەش کەسێك بەدەوری مێزێکدا دانیشتن. دەبێ ڕێکخەری ئاهەنگەکە چەند مێز ئامادەبکا بۆئەوەی گشت بەشداربوان لەدەوری دابنیشن.

```
      ٣٠٨
  ٦ |١٨٥٣
     ١٨  -
     ——
     ٠٥
      ٠  -
     ——
     ٥٣
     ٤٨ -
     ——
      ٥
```

لەبەرئەوەی ٣٠٨ مێز بەشی هەموو بەشداربوان ناکات. بۆیە پێویستە ڕێکخەری ئاهەنگەکە ٣٠٩ مێز ئامادەبکا.

**ب** ڕۆشنا ١٣١ گوڵی هەیە. ئایا دەتوانی چەند چەپکی شەش گوڵی ئامادە بکات.

```
      ٢١
  ٦ |١٣١
     ١٢ -
     ——
     ١١
      ٦-
     ——
      ٥     ماوە ٥
```

دەتوانی ٢١ چەپك ئامادەبکات. چونکە ٥ گوڵە ماوەکەی بەشی چەپکێکی تر ناکات.

**ج** سەرۆکی تیمی دێدەوانی پەتێکی بەکارهێنا کە درێژیەکەی ١٤٥سم بۆ نیشاندانی ڕێگەی دروستکردنی گرێدان پەتەکەی کرد بە ٤ بەشی یەکسانەوە درێژی هەر بەشێك چەندە؟

```
      ٣٦
  ٤ |١٤٥
     ١٢  -
     ——
     ٢٥
     ٢٤ -
     ——
      ١     ماوە ١
```

کەواتە درێژی هەر بەشێك لە پەتەکەی $\frac{١}{٤}$ ٣٦سم.

### باسبکە

• ڕوونبیکەوە چۆن ماوەکە لە وەڵامی پرسیاری أ و ج بەکارهات؟

• ڕوونبیکەوە بۆچی ژمارەی کەرتی وەك ماوە شیاوە لە پرسیاری ج وە شیاو نیە لەهەردوو پرسیاری أ و ب ؟

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**شیکاریکە پاشان ماوەکە لێکبدەوە.**

**١** شاباز ١٧٠ کتێبی هەیە، ویستی بەیەکسانی بەسەر ٥ ڕەفەی کتێبخانەکەیدا دابەشبکا. زۆرترین ژمارەی کتێب لەسەر هەر ڕەفەیەك چەندە؟ چەند کتێب دەمێنێتەوە؟

**٢** کۆمەڵێك لە ١٨ کچ فێری ڕێکخستنی گوڵەکان دەبن، ١٢٤ گوڵیان لایە. ئایا ژمارەی گوڵەکان بەشدەکەن بۆئەوەی هەر کچێك کۆمەڵەیەك لە ٧ گوڵ ڕێکبخات؟

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بەکاربهێنە
ئامێرێك بۆ دروستکردنی گەنمەشامی کەهەرجارێك ٨٠ پەرداخ گەنمەشامی دروستدەکات.

| کیسی گەنمەشامی (شامەدەری) | |
|---|---|
| پێوانە | پەرداخەکان لەهەرکیسێکدا |
| بچووك | ٤ پەرداخ |
| گەورە | ٦ پەرداخ |




**٣** ئاران لە هەر کردارێکی دروستکردنی گەنمە شامیدا دەتوانی ١٣ کیسی گەورە پربکات. چۆن ماوەکەی لێکدایەوە؟

أ ماوەی نیە.
ب ماوەکەی فرامۆش کردووە.
ج ماوەکەی نزیکردەوە.
د ماوەکەی بەکارهێنا.

**٤** هیران ٨ کیسی لەپێوانە گەورەکە فرۆشت ئایا ئەو گەنمەشامیەی ماوەتەوە٩ کیسی بچووك پردەکات؟ دەتوانیٚ چەند کیسی بچووك پربکات؟

أ نەخێر، ٨ کیس
ب نەخێر، ٣ کیس
ج بەڵێ، ١٠ کیس
د بەڵێ، ٨ کیس

### جێبەجێکردنە جیاوازەکان

**٥** ٢١٣ قوتابی لە چەند قوتابخانەیەك بۆ ڤیستیڤاڵی ساڵانە ناویان تۆمارکرد، زۆرترین ژمارەی قوتابیان لەگەڵ هەر مامۆستایەك ٩یە. کەمترین ژمارەی مامۆستایانی پێویست چەندە؟

**٦** کارمەند ٢٨٨ وێنەی هەیە، ئەلبومێکی ٥٠ پەڕەیی کڕی. لە هەر پەڕەیەکی شوێنی ٦ وێنە دەبێتەوە. ئایا کارمەند دەتوانیٚ هەموو وێنەکان لەناو ئەلبومەکەدا دابنیٚ؟ وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

**٧** ١٠٥ قوتابی دابەشکران بەسەر پاسەکانی قوتابخانەدا بۆ ڕۆیشتن بۆ گەشتی قوتابخانە. ئەگەر هەر پاسێك ٤٢ قوتابی بگرێت. ئایا دوو پاس بەشی گواستنەوەی قوتابیان دەکات.

**٨** **شێوازەکان** خونچە ملوانکە دروستدەکات، ویستی ٦٠ موروو بەکاربێنیٚ. شێوازێکی داهێنا کە بریتییە لە دانانی موروویەکی سور و یەکی شین و پاشان کەسك، ڕەنگی مورووی سی و یەکەمین چۆنە؟

**٩** ماوەی نێوان ماڵی دەرباز و مزگەوت ١٢٤٧م کە دەکاتە ٤ ئەوەندی ماوەی نێوان ماڵ و قوتابخانەی. قوتابخانەکە چەند لە ماڵی دەربازەوە دوورە؟

**١٠** **پرسیار بنووسە** دابەشکردن و لێکدانەوەی ماوە پێویستە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیار. ڕوونیبکەوە چۆن ماوە بەشداری لە وەڵامدانەوەی پرسیار دەکا؟

# پێداچوونەوە
# Review

| |
|---|
| ماوە remainder |
| سفر zero |
| بەهایی خانەیی place value |
| شێوازەکان patterns |
| خەملاندن estimate |
| چەندجارەکان multiples |

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

**دەستەواژەی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.**

١ بۆ دڵنیابوون لە دابەشکردندا دەکرێت ___؟___ بەکاربێت.

٢ دەتوانیت ڕاستیە بنەڕەتیەکان و ___؟___ بەکاربێنی بۆ دابەشکردن بەسەر چەندجارەکانی دە.

٣ ___؟___ بریتییە لە بەهای ماوە دوای ئەژمێرکردنی ئەنجامی دابەشکردن.

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

**ئەژمێری هزری بەکاربهێنە بۆ تەواوکردن.**

٤ ٤٩٠ ÷ ٧٠ = ٧
٤ ٩٠٠ ÷ ٧٠ = ٧٠
٤٩ ٠٠٠ ÷ ٧٠ = ■

٥ ٦٤٠ ÷ ٨٠ = ٨
٦ ٤٠٠ ÷ ٨٠ = ■
٦٤ ٠٠٠ ÷ ٨٠ = ٨٠٠

٦ ٨١٠ ÷ ٩٠ = ■
٨ ١٠٠ ÷ ٩٠ = ■
٨١ ٠٠٠ ÷ ٩٠ = ٩٠٠

**دابەشبکە.**

٧ ٩)٥٠٤

٨ ٧)٤ ٣٠٨

٩ ٨)٩٩٨

١٠ ٦)١ ٢٤١

١١ ٤٥)٤ ٢٩٢

١٢ ٢٣)٦٦ ٨٠٤

١٣ ٢٧)٣٤٤

١٤ ٧١)٦٨٥ ٢١٠

**هەر هاوکێشەیەك شیکاربکە.**

١٥ ٣٦٠ ÷ ن = ٧٢
ن = ٤یان ٥یان ٦

١٦ ك ÷ ٨ = ٤٣
ك = ٣٣٦ یان ٣٤٤

١٧ س ÷ ٣ = ٩٧
س = ٢٩١ یان ٢٩٤

١٨ ٥٠٤ ÷ ن = ٧٢
ن = ٧ یان ٨ یان ٩

١٩ ٩٦ ÷ س = ٨ شیکاربکە پاشان وەڵامەکەت ساغبکەوە.

٢٠ ن ÷ ٥ = ٧ شیکاربکە پاشان وەڵامەکەت ساغبکەوە.

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

**شیکاربکە. ڕوونبکەوە چۆن ماوەکە لێکدەدەیەوە.**

٢١ ١٢٣ قوتابی لەوانەی هونەردا ناویان تۆمارکرد. هەر پۆلێك تەنها جێگای ١١ قوتابی دەبێتەوە. کەمترین ژمارەی پۆلی پێویست چەندە؟

٢٢ هەرێم ٣٠٠ ئۆتۆمبیلی بچووکی هەیە، ویستی بیخاتە ناو ٧ کارتۆن کە هەریەکەیان ٤٢ ئۆتۆمبیل دەگرێت. ئایا ئەو کارتۆنانە بەشی هەموو ئۆتۆمبیلەکان دەکا؟ ڕوونبکەوە.

٢٣ هەژیر پارچە شیرینی بە پاکەت دەفرۆشی. هەر پاکەتەی ٦ پارچە دەگرێت. ٢٢٦ پارچە شیرینی هەبێ چەند پاکەت شیرینی دەفرۆشێت؟

٢٤ هاوڕێ پەتێکی ٦٠م کرد بە ٨ بەشی یەکسان. درێژی هەر بەشێك چەندە؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep




**ڕێگایەك بڕیاربدە**

لە پرسیاری ٦، بۆ دیاریکردنی ژمارەی گوڵەکان بە ٥ چەپك دەستپێبکە. ڕستەیەکی ژمارەیی بنووسە دیاریبکات چەند دەفر پێویستە بۆ دابەشکردنی گوڵەکان، ئەگەر هەر دەفرێك تەنها ٣ گوڵ بگرێ، پاشان پرسیارەکە شیکاربکە.

**وەڵامی گونجاو لە پرسیارەکانی ١ تا ٧ هەڵبژێرە.**
**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ١ تا ٣ بەکاربهێنە.**

| ئەو وڵاتانەی زۆرترین ژمارە هۆڵی سینەمایان هەیە | |
|---|---|
| وڵات | ژمارەی هۆڵەکان |
| هیندستان | ٨ ٩٧٥ |
| ولایەتە یەکگرتوەکان | ٢٣ ٦٦٢ |
| چین | ٤ ٣٦٤ |
| ئۆکرانیا | ١٤ ٩٦٠ |

**١** ئەگەر فلمێکی سینەمایی لەنیوەی سەرجەمی ژمارەی هۆڵەکانی ولایەتە یەکگرتووەکان و چین پیشاندرا، ژمارەی ئەو هۆڵانە چەندە؟

أ ١ ٤١٣ ‏ ‏ ج ١١ ٨٣١
ب ٢ ١٨٢ ‏ ‏ د ١٤ ٠١٣

**٢** ژمارەی هۆڵەکان لە ولایەتە یەکگرتووەکان چەندی زیاترە لە ژمارەیان لە ئۆکرانیا؟

أ ٣٨ ٦٦٢ ‏ ‏ ج ١١ ٣٠٢
ب ١٨ ٧٠٢ ‏ ‏ د هیچیان نییە

**٣** کام وڵات ئەگەر ژمارەی هۆڵەکانی بەسەر ٢ دابەشبکرێت ماوە دەمێنێتەوە؟

أ ولایەتە یەکگرتوەکان
ب چین
ج هیندستان
د ئۆکرانیا

**٤** دەشنێ بازنەیەك لە ١٨ مورو دروست دەکات. ٧٢ مورووی هەیە، دەتوانێ چەند بازن دروست بکات؟

أ ٤ ‏ ‏ ج ٥٤
ب ٦ ‏ ‏ د ٩٠

**٥** خانەی ڕەنووسی یەکەم لە ئەنجامی دابەشکردنی ٦٣٣ ÷ ٧٢ کامەیە؟

أ خانەی هەزاران ‏ ‏ ج خانەی دەیان
ب خانەی سەدان ‏ ‏ د خانەی یەکان

**٦** چەند دەفرمان پێویستە بۆ دابەشکردنی ٥ چەپکە گوڵ. ئەگەر هەر چەپکێك ٦٥ گوڵی تیابێت، وە هەر دەفرێك ٣ گوڵ بگرێت؟

أ ٣٠٠ ‏ ‏ ج ١٠٨
ب ١٢٥ ‏ ‏ د ١٠٠

**٧** ٨١٥ ÷ ٨

أ ١٠١ماوە ٧ ‏ ‏ ج ١٠٠ماوە ١٥
ب ١٠١ماوە ٥ ‏ ‏ د باس نەکراوە

## ئەوەی دەیزانی بینووسە Write What You Know



**٨** تیپی قوتابخانە ١٢ یاری تۆپی پێی لە مانگی ئازاردا کرد و ١٦ یاریشی لە مانگی نیساندا. ٩ ٢٤٠ کەس ئامادەی بینینی دوو یارییەکە بوون، ناوەندەی ئامادەبوون لەهەر یاریەکدا چەندە؟

**٩** لە قوتابخانەکەدا سێ پۆلی پێنجەم هەیە و لە هەر یەکەیاندا ٢٨ قوتابی تێدایە. قوتابیەکان دابەشکرانە سەر چەند کۆمەڵەیەکی ٩ قوتابیی جگە لە کۆمەڵەی کۆتایی، ژمارەی قوتابیانی کۆمەڵەی کۆتایی چەندە؟ وەڵامەکەت ڕونبکەوە

بەشی ٧

# دابەشکردنی ژمارە دەیییەکان

## Dividing Decimals

لەبازاری سەوزە فرۆشەکان دەتوانی میوە وتەڕەی نوێ وخواردەمەنی تر بکڕی ودەتوانی چاوت بەو جوتیارانە بکەوێ کە بەرهەمەکانیان دەفرۆشن.

پرسیار بۆ شیکار سالار هەندێ میوەی ناو کیسەی کڕی بڕوانە خشتەکە و پاشان ناوەندی بارستایی هەر میوەیەك بخەملێنە؟

| میوەی تازە | | |
|---|---|---|
| میوەکە | بارستایی کیس (کگم) | ژمارەی دانەکانی هەرکێسێك |
| سێو | ٠,٩٩ | ٥ |
| پرتەقاڵ | ١,٨٠ | ٦ |
| شەمامەی زەرد | ١,٤٩ | ٢ |
| شەمامەی سەوز | ٣,٠٠ | ٤ |
| شووتی | ٩,٩٢ | ٢ |

# زانیارییەکانت ساغبکەوە
# Check what you know



ئەم لاپەڕەیە بەکار بێنە بۆ دڵنیا بوون لە
هەبوونی ئەم زانیاریيانەی کەوا پێویستە بۆ ئەم بەشە

## زاراوەکان

دەستەواژەی گونجاو لەلیستەکەدا هەڵبژێرە.

ژمارە دەيەکییە هاوتاکان equivalent decimals
بەشدراو divisor
بەشکراو dividend
ئەنجامی دابەشکردن «بەرکەوت» quotient

١ ژمارە ٣ لە ٣٩٦ ÷ ٣ = ١٣٢ بریتییە لە ___؟___ .

٢ ژمارە ٦٥ لە ٦٥ ÷ ٥ = ١٣ بریتییە لە ___؟___ .

٣ ٠,٦، ٠,٦٠ نموونەن لەسەر ___؟___ .

## لێکدان لە ١٠ و لە ١٠٠.

٤ ١٠ × ٧
١٠٠ × ٧

٥ ١٠ × ٦,٤
١٠٠ × ٦,٤

٦ ١٠ × ٠,٤
١٠٠ × ٠,٤

٧ ١٠ × ٠,٠٩
١٠٠ × ٠,٠٩

## شێوازەکانی دابەشکردن

شێوازەکە تەواوبکە.

٨ ٣٥٠ ÷ ٥٠ = ٧
٣ ٥٠٠ ÷ ٥٠ = ٧٠
٣٥ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = س

٩ ٣٢٠ ÷ ٨٠ = ٤
س ÷ ٨٠ = ٤٠
٣٢ ٠٠٠ ÷ ٨٠ = ٤٠٠

١٠ ٤٠٠ ÷ ٥٠ = ٨
٤ ٠٠٠ ÷ س = ٨٠
٤٠ ٠٠٠ ÷ ٥٠ = ٨٠٠

ئەنجامی دابەشکردن بدۆزەوە.

١١ ٢٠⟌٨٠

١٢ ١٠⟌٦٠

١٣ ٦٠⟌٤٢٠

١٤ ٨٠⟌١٦٠

## دابەشکردنی ژمارە دەیيەکان بەسەر ژمارە سروشتیيەکان

پرسیارەکە کۆپی بکە. فاریزەکە لەشوێنی گونجاوی ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ.

١٥ ٣⟌١٠,٢٦ (٣٤٢)

١٦ ٥⟌٨١,٥ (١٦٣)

١٧ ٢٣⟌١٩٠,٩ (٨٣)

١٨ ٦٢⟌٢٧٩,٠ (٤٥)

ئەنجامی دابەشکردن بدۆزەوە.

١٩ ٦⟌٤,٣٨

٢٠ ٨⟌٢٠,٦٤

٢١ ٧⟌٦,٥٨

٢٢ ٤⟌٩,٢

٢٣ ٢٦,٧٥ ÷ ٥

٢٤ ٣,١٦ ÷ ٤

٢٥ ١,٠٨ ÷ ٩

٢٦ ٣١٥,٢٠ ÷ ٥

## ژمارە دەیيە هاوتاکان

دوو ژمارەی دەیيەکی هاوتا بۆهەر ژمارەیەك بنووسە.

٢٧ ٠,٨

٢٨ ٠,٢٥

٢٩ ١,٣

٣٠ ٢,٦٠

وانەی ١

# نواندنی دابەشکردن
# Divide Representation






### پێداچوونەوەی خێرا

١ $9\overline{)27}$

٢ $8\overline{)64}$ ٣ $8\overline{)72}$

٤ $7\overline{)56}$ ٥ $6\overline{)54}$

### کەرەستەکان

نموونەی دەیی، قەڵەم مقەست

## بدۆزەرەوە

دەتوانی نموونەیەك دروستبکەی بۆ دۆزینەوەی ئەنجامی دابەشکردنی ژمارەیەکی دەیی بەسەر ژمارەیەکی سروشتیدا.

### چالاکی ١

ئەژمێربکە ١,٥ ÷ ٣ $3\overline{)1.5}$

**هەنگاوی ١**

١,٥ بەرەنگی شێوەی دەییەکان بنوێنە.



**هەنگاوی ٢**

هەر شێوەیەك بۆ نواندنی دەیەکیەکان ببڕە.



**هەنگاوی ٣**

دەیەکیەکان بەیەکسانی بەسەر ٣ کۆمەڵە دابەشبکە، لەهەر کۆمەڵەیەکدا ٥ دەیەکی هەبێت.



**هەنگاوی ٤**

ڕستەی دابەشکردنە ژمارەییەکە تۆماربکە.

٠,٥ = ٣ ÷ ١,٥

کەواتە، ١,٥ ÷ ٣ = ٠,٥

چۆن دوو کۆمەڵەی یەکسان لەکرداری دابەشکردندا ١,٤ ÷ ٢ دەنوێنی؟

**لەبیرت نەچێ** بەکارهێنانی شێوەکان یارمەتی پێشبینی کرداری دابەشکردنی ژمارە دەییەکان دەدات.
ڕوونییکەوە چۆن ئەم شێوازە ١٥٠ ÷ ٣ = ٥٠
بەکاردەهێنی بۆئەوەی نیشانی بدەی ١٥ ÷ ٣ = ٥
کە ئەنجامی دابەشکردنەکە ڕاستە ١,٥ ÷ ٣ = ■

### هەوڵبدە

**نموونەیەك بهێنە بۆ ڕوونکردنەوەی دابەشکردن، ڕستەی ژمارەیی بۆئەم نموونەیە تۆماربکە.**

أ ١,٤ ÷ ٢ ب ٠,٩ ÷ ٣

ج ٢,٥ ÷ ٥ د ١,٦ ÷ ٤

## بەبەستەوە

**چالاکی ٢** دەتوانی نموونەی بەشەکان لەسەد بەکاربهێنیت بۆ دیارکردنی ٠,٢٤ ÷ ٦.

**هەنگاوی ١**
٠,٢٤ بەرجەستەکردنی شێوەی بەشەکان لەسەد بنوێنە.



**هەنگاوی ٢**
نموونەکە ببڕە بۆ دیاری کردنی بەشەکان لەسەد.



**هەنگاوی ٣**
بەشەکانی سەد بەیەکسانی بەسەر ٦ کۆمەڵە دابەشبکە. لەهەر کۆمەڵەیەکدا ٤ بەش لەسەد هەبێت.



**هەنگاوی ٤**
ڕستەی دابەشکردنە ژمارەییەکە تۆماربکە
٠,٠٤ = ٦ ÷ ٠,٢٤

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**نموونەیەك دروستبکە پاشان ئەنجامی دابەشکردنەکە بدۆزەوە.**

| | | |
|---|---|---|
| ١ ٠,٠٨ ÷ ٢ | ٢ ٠,٢٤ ÷ ٢ | ٣ ٠,١٥ ÷ ٣ |
| ٤ ١,٢ ÷ ٤ | ٥ ٠,١٢ ÷ ٤ | ٦ ٣,٥ ÷ ٥ |
| ٧ ٢,٤ ÷ ٣ | ٨ ٠,٠٨ ÷ ٨ | ٩ ٠,٣٩ ÷ ٣ |
| ١٠ ٠,٤٤ ÷ ٢ | ١١ ٠,١٨ ÷ ٩ | ١٢ ٠,١٨ ÷ ٦ |

**نموونەکە بەکاربهێنە بۆ تەواوکردنی ڕستە ژمارەییەکە.**

١٣

٠,٣٠ ÷ ٢ = س

١٤

٠,١٢ ÷ ٣ = س

١٥ بارستایی دوو پاکەت و دوو کتێب ٧,٢٠کگم. ئەگەر بارستایی دوو پاکەتەکە ٤,٢٠کگم بێت. بارستایی یەك کتێب چەندە؟

١٦ **هەڵە لەکوێدایە؟** تەماشای نموونەی کرداری ٠,١٦ ÷ ٤ بکە و هەڵە وڕاستەکەی دیاریبکە.



## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

١٧
$$\begin{array}{r} 5000 \\ -\ 3436 \\ \hline \end{array}$$

١٨
$$\begin{array}{r} 4{,}846 \\ +\ 1{,}404 \\ \hline \end{array}$$

١٩ چوار و بەشێك لەهەزار بەڕەنووسی بنووسە

٢٠ ژمارەیەکی هاوتا بۆ ژمارەی ٠,٩٠ بنووسە.

٢١ (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) بەهای ن چەندە لە هاوکێشەی ٥٨ = ن + ٣٩؟

أ ن = ٩
ب ن = ١٩
ج ن = ٢٠
د ن = ٩٠

وانەی ٢

# دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی سروشتی

**Divide by Natural Number**



**پێداچوونەوەی خێرا**

١ ٢٤٦ ÷ ٦

٢ ٥٢٠ ÷ ٥  ٣ ١٢٦٠ ÷ ٣

٤ ٥٦٤ ÷ ٤  ٥ ٤٨٠٦ ÷ ٦

## فێربە

**بفرە ئەی کۆلارە بفرە** کارە و دوو هاوڕێی ٣ کۆلارەیان لە قوماش دروستکرد. شریتێکی قوماشی تەنك درێژیەکەی ٤,٢م بەیەکسانی بەسەر خۆیاندا دابەشکرد بۆئەوەی بۆهەر کۆلارەیەك کلکێك دروستبکەن. درێژی کلکی هەر کۆلارەیەك چەندە؟



### نموونە

ئەژمێربکە ٤,٢ ÷ ٣

بخەملێنە ٣ ÷ ٣ = ١

**ڕێگای یەکەم** دەتوانی دابەشکردن بکەی بە بەکارهێنانی نموونە.

**هەنگاوی ١**

نموونەکانی دەیی بۆ نواندنی ٤,٢ ڕەنگبکە



**هەنگاوی ٢**

نموونەکان بەسەر ٣ کۆمەڵەدا بە یەکسانی دابەشبکە



ڕوونبکەوە چۆن ژمارەی ژمارە سروشتیەکان و ژمارەی دەیەکیەکان دەناسی کە لە هەر کۆمەڵەیەکدا دایدەنێیت.

**ڕێگای دووەم** بە بەکارهێنانی کاغەز و پێنووس دەتوانی دابەشکردن بکەیت.

**هەنگاوی ١**

فاریزەی ئەنجامی دابەشکردنەکە لەسەر فاریزەی بەشکراوەکە دابنێ.

$3\overline{)4,2}$

**هەنگاوی ٢**

دابەشبکە وەك چۆن لە ژمارە سروشتیەکاندا دابەشدەکەیت.

$$\begin{array}{r} 1,4 \\ 3\overline{)4,2} \\ -3\phantom{,2} \\ \hline 12 \\ -12 \\ \hline 0 \end{array}$$

کەواتە، درێژی کلکی هەر کۆلارەیەك ١,٤م. لەبەرئەوەی وەڵامەکە نزیکە لە وەڵامە خەملێنراوەکە. کەواتە وەڵامەکە شیاوە.

## نموونەی زیاتر

**أ** دابەشبکە ٢,٤٩ ÷ ٣

```
      ٠,٨٣
  ٣ | ٢,٤٩
    - ٠
    ----
      ٢٤
    - ٢٤
    ----
      ٠٠٩
     - ٩
    ----
       ٠
```

بەشدراوەکە ← لە بەشکراوەکە گەورەترە. کەواتە سفر لە خانەی یەکان دابنێ.

دەتوانی لێکبدەی بۆ دڵنیابوون لە وەڵامەکەت.

ساغبکەوە √

```
  ٠,٨٣
 × ٣
 ------
  ٢,٤٩
```

**ب** دابەشبکە ١٨,٤٥ ÷ ١٥

```
        ١,٢٣
  ١٥ | ١٨,٤٥
     - ١٥
     ------
        ٣٤
      - ٣٠
     ------
        ٠٤٥
       - ٤٥
     ------
         ٠٠
```

ساغبکەوە √

```
   ١,٢٣
 × ١٥
 ------
   ٦١٥
 + ١٢٣
 ------
  ١٨,٤٥
```

**ج** دابەشبکە ٤٢٣,٥ ÷ ٧

```
       ٦٠,٥
  ٧ | ٤٢٣,٥
    - ٤٢
    ------
      ٠٠٣
     - ٠
    ------
       ٣٥
     - ٣٥
    ------
       ٠٠
```

لەبەرئەوەی ← ٧ > ٣ سفر لەخانەی یەکان دابنێ.

ساغبکەوە √

```
  ٦٠,٥
 × ٧
 ------
  ٤٢٣,٥
```

**لەبیرت نەچێ** ئەگەر بەشکراو ژمارەیەکی دەیی و بەشدراو ژمارەیەکی سروشتی بێت وەك چۆن ژمارە سروشتیەکان دابەش دەکەیت، بە هەمان شێوە دابەشبکە، فاریزەی ئەنجامی دابەشکردنەکە لەسەر فاریزەی بەشکراوەکە دابنێ.



### ساغبکەوە

**١** باسبکە فاریزەکە لە ئەنجامی دابەشکردندا لەکوێیدا دادەنێیت کاتێك ژمارەیەکی دەیی بەسەر ژمارەیەکی سروشتیدا دابەشدەکەیت.

**وێنەیەك بۆ دیاریکردنی ئەنجامی دابەشکردنەکە بکێشە.**

**٢** ١,٢٦ ÷ ٣



**٣** ٢,٣٨ ÷ ٧



**ئەنجامی دابەشکردن کۆپی بکە و فاریزە لەشوێنی دروست دابنێ.**

**٤** ٢ | ١,٠٦ ، ئەنجام: ٠٥٣

**٥** ٥ | ٠,٠٤٥ ، ئەنجام: ٠٠٠٩

**٦** ٧ | ٤٩,٠ ، ئەنجام: ٧٠

**٧** ٤ | ٣٢,٦٠ ، ئەنجام: ٨١٥

**ئەنجامی دابەشکردن بدۆزەوە، ساغکردنەوە بە لێکدان بکە.**

**٨** ٦ | ٤,٨    **٩** ٩ | ٩,٠٩    **١٠** ٤ | ١٢,٠٤    **١١** ٢ | ١,٠٤

**١٢** ٣٥,٧ ÷ ٧    **١٣** ٠,٨٠ ÷ ٥    **١٤** ٤,٣٥٥ ÷ ٥    **١٥** ١١٥,٢ ÷ ٢٤

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

ئەنجامی دابەشکردنەکە کۆپی بکە و فاریزەکە لە شوێنە دروستەکەدا دابنێ.

- **١٦** ٧⟌٦,٣ (٠٩)
- **١٧** ٤⟌٨,٠٨ (٢٠٢)
- **١٨** ٨⟌٦,٠٠ (٠٧٥)
- **١٩** ١٥⟌٤,٠٥ (٠٢٧)
- **٢٠** ٦⟌٤,٢٧٢ (٠٧١٢)
- **٢١** ٣⟌٠,٣٦٦ (٠١٢٢)
- **٢٢** ٨⟌٢٧,٢٨ (٣٤١)
- **٢٣** ٥⟌٦١,٨٠ (١٢٣٦)

ئەنجامی دابەشکردنەکە بدۆزەوە. بەلێکدان ساغیبکەوە.

- **٢٤** ٨⟌٧٤,٤
- **٢٥** ٣⟌٢٧,٩
- **٢٦** ٥⟌٥٥,٥٥
- **٢٧** ٢⟌١٩,٦٤
- **٢٨** ٧⟌٨٥,٤
- **٢٩** ٧٠⟌٨٥٤,٠
- **٣٠** ٣⟌٩٣,٦٦
- **٣١** ٥⟌٦,١٥
- **٣٢** ٨⟌٣٣,٠٤
- **٣٣** ٤⟌٢١,٥٦
- **٣٤** ١٤⟌٥٩,٢٢
- **٣٥** ١٩⟌٢٣٤,٨٤
- **٣٦** ١٢⟌٣٩,٠
- **٣٧** ١٠⟌٢١٢,٥
- **٣٨** ٩⟌٣٤٣,٨٩
- **٣٩** ١١⟌٥٧٠,٩
- **٤٠** ٦ ÷ ٢٤,٦
- **٤١** ٦ ÷ ٢,٤٦
- **٤٢** ٣ ÷ ٠,٩٣
- **٤٣** ٧ ÷ ٨,٠٥
- **٤٤** ٦ ÷ ٠,٥٤
- **٤٥** ٨ ÷ ٥,٠٤
- **٤٦** ٨ ÷ ٧٢,٦٤
- **٤٧** ٩ ÷ ٤٨,٦
- **٤٨** ٧ ÷ ٤٨,٣
- **٤٩** ٥ ÷ ١٨,٥
- **٥٠** ٤ ÷ ٢١,٦
- **٥١** ٨ ÷ ٤,٢٤

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ساروٚ بۆیەی ئاوی بۆ وێنە کێشانی تابلۆکانی بەکارهێنا پێدراوەکان لە لیستەکەدا بۆ شیکاری پرسیارەکان لە ٥٢ تا ٥٥ بەکاربهێنە.




- **٥٢** ساروٚ چەند بۆیە بۆ ڕەنگکردنی چۆلەکەیەك بەکاردەهێنێ؟
- **٥٣** ساروٚ چەند بۆیە بۆ ڕەنگکردنی دوو پەپوولە بەکاردەهێنێ؟
- **٥٤** بۆ ڕەنگکردنی ٦ گەڵای ڕووەك ودووگوڵ چەندی پێویستە؟
- **٥٥** **پرسیار بنووسە** پێدراوە هاتووەکان لە لیستەکەدا بەکاربهێنە. کە بەدابەشکردنی ژمارەیەکی دەیی شیکاردەبێ. پرسیارەکە شیکار بکە.
- **٥٦** ئاوارە ١٧,٢٥کیلۆگرام سێوی لەماوەی ٥ کاتژمێردا لێکردەوە. لەماوەی یەك کاتژمێردا چەند کگم سێو لێدەکاتەوە؟
- **٥٧** **پرسیار چییە؟** جیاوازی نێوان نرخی دوو کتێب ١٦. هەزار دینار و سەرجەمی نرخەکانیان ٤٢ هەزار دینار. وەڵام ٢٩ هەزار دینار.

٥٨ ٣ بوتڵ ٣,٧٩ لتر ئاویان تێدایە، نیوەدرزەن لە بوتڵی تر ٧ لتر ئاویان تێدایە، کام جۆریان فراوانییەکەی گەورەترە؟

٥٩ کارتۆنێك ٣ قوتوو کەرەی تێدایە و بارستاییەکەی ٠,٨٥٠کیلۆگرام، هەنێ پێویستی بە ٠,٣کیلۆگرام کەرە هەیە ئایا قوتوویەك بەشی دەکات؟ ئەمە ڕوونبکەوە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

٦٠ ٢٤ ٨٠٤ بەسەر ٤ دابەشبکە

٦١ ٣٤٥ ÷ ٢

٦٢ ٤ × (٢٥ + ٢)

٦٣ < یان > یان = دابنێ ٠,٠٩٨٩٨ ⬜ ٠,٩٨٩٨

٦٤ ژمارە ٢١٣ ٦٧٥ بەپیت بنووسە.

٦٥ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە بەهای ی لە هاوکێشەکەدا بدۆزەوە.

ی+ ٤٢ = ٨٠

أ ی = ٣٨ ج ی = ١١٨

ب ی = ٤٨ د ی = ١٢٢

٦٦ زانا بە درێژایی ٩ ڕۆژ بەرزترین پلەی گەرمی تۆمارکرد کە بریتیبوو لە: ٢٩°، ٣٢°، ٢٤°، ٣٢°، ٢٨°، ٣٤°، ٢٦°، ٣٠°، ٣٢°، ناوەندەی پلەکانی گەرمی چەندە؟

٦٧ ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە کاردۆ دوو بەکرەی لە پەت بەکارهێنا کە درێژی پەتەکە لەهەر یەکێکیاندا ١١,٩٨م بوو وە بەکرەیەك درێژی پەتەکەی ١٨,٩٨م بوو. و ٣ بەکرەی تریش کە درێژی هەریەکەیان ٢,٠٥م بوو کاردۆ چەند مەتر پەتی بەکارهێناوە؟

أ ٤٩,٠٠ م ج ٦١,٠٧ م

ب ٤٩,٠٩ م د ١٤٠,٠٥ م

## شیکاری پرسیارەکان  گۆشەی ڕوونا کبیران

**ڕێنوێنی** مامۆستا ئاراز ١٢٠م کاغەزی هەبوو هەندێکی بەکارهێنا بۆ دروستکردنی کۆلارەی شێوە جیاواز بۆ قوتابییەکانی ٨,٢٥م لامایەوە. مامۆستاکە بڕیاریدا ئەوەی بڕیویەتی بۆ دروستکردنی کۆلارەکە تۆماری بکات.



| پێداویستیەکانی کۆلارە | | | |
|---|---|---|---|
| جۆری کاغەز | درێژی | بڕ | درێژی گشتی |
| زەرد | ١,٥٠ م | ١٢ | ١٨,٠٠ م |
| سوور | ٢,٧٥ م | ⬜ | ٢٧,٥٠ م |
| شین | ٣,٠٠ م | ⬜ | ⬜ |
| سەوز | ⬜ | ٥ | ١٢,٢٥ م |
| سەرجەم ⟵ | | | ⬜ |

**وەڵامی گونجاو بۆ شیکاری پرسیاری ١، ٢ هەڵبژێرە. پاشان خشتەکە کۆپی و تەواوبکە.**

١ چۆن بڕی کاغەزی بەکارهاتوو دیاریدەکەی؟

أ ١٨,٠٠ + ٢٧,٥٠ + ١٢,٢٥٠ ئەژمێربکە و پاشان سەرجەم لە ١٢٠,٠٠ دەربکە.

ب ٨,٢٥ لە ١٢٠,٠٠ دەربکە.

ج ١٢٠,٠٠ لەگەڵ ٨,٢٥ کۆبکەوە.

د هەموو ژمارەکان لەخشتەکەدا کۆبکەوە.

٢ جەبر ئەگەر س درێژی کاغەزی سەوز بنوێنێ. بۆ دروستکردنی کۆلارەیەك کام هاوکێشە بەکاردێنی بۆ دۆزینەوەی بەهای س ؟

أ س = ١٢,٢٥ × ٨ ج س ÷ ١٢,٢٥ = ٥

ب ١٢,٢٥ − س = ٥ د ١٢,٢٥ ÷ ٥ = س

وانەی ٣

# لەکەرتەکانەوە بۆ ژمارە دەیيەکان

# Changing from Fractions to Decimals



**پێداچوونەوەی خێرا**

بۆهەر ژمارەیەك دەیەکی دوو ژمارەی هاوتا دیاربیکە.

١ ٠,٥  ٢ ٣,٤

٣ ٢,٧٠  ٤ ٠,١٤

٥ ٠,٧٠٠

## فێربە

**جەژنی نەورۆز** قوتابیانی قوتابخانەی کوردستانی کچان خۆیان ئامادەکرد بۆ گێڕانی ئاهەنگی جەژنی نەورۆز لە قوتابخانەکەیان $\frac{٢}{٥}$ی قوتابیان هاوبەشیان لە یاریە وەرزشیەکاندا کرد. $\frac{١}{٤}$ی قوتابیان هاوبەشیان لە وتنی سروودی «ئەی ڕەقیب» دا کرد لەکاتی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان. ژمارەی بەشداربووان لە کام چەلاکیدا زۆرتربوون؟



دەتوانی بەراوردیان بکەیت بە نووسینیان لەسەر شێوەی کەرتی دەیی.

**لەبیرت نەچێ** سەرە دابەش ژێرە بکە تا ژمارەیەکی دەیی هاوتا بەکەرتەکەت دەستبکەوێ

**لەبیرت بێ**

کەرتی $\frac{١}{٤}$ دەخوێندرێتەوە: چواریەك یان یەك لەچوار یان یەك دابەش بەسەر چوار یان یەك لەسەر چوار.

### نموونە بەراوردبکە $\frac{٢}{٥}$ و $\frac{١}{٤}$

**هەنگاوی ١**

هەر کەرتێك لەسەر شێوەی پرسیاری دابەش بنووسە

$\frac{٢}{٥} \longrightarrow ٥\overline{)٢}$

$\frac{١}{٤} \longrightarrow ٤\overline{)١}$

**هەنگاوی ٢**

دابەشبکە وەك ئەوەی ژمارەکان سروشتین. لەکاتی پێویستدا فاریزە و سفرەکان لە بەشکراودا دابنێ. فاریزە و سفر لەئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ.

$٥\overline{)٢,٠} = ٠,٤$ ؛ $٢٠ - ٢٠ = ٠$

$٤\overline{)١,٠٠} = ٠,٢٥$ ؛ $١٠ - ٨ = ٢$ ، $٢٠ - ٢٠ = ٠$

لەبەرئەوەی ٠,٤ > ٠,٢٥ کەوا $\frac{٢}{٥} > \frac{١}{٤}$، بەشداربووان لە وەرزش ژمارەیان زۆرترە.

### پرسیاری زیاتر

أ $\frac{١}{٥} \longrightarrow ٥\overline{)١,٠} = ٠,٢$ ؛ $١٠ - ١٠ = ٠$

ب $\frac{٣}{٤} \longrightarrow ٤\overline{)٣,٠٠} = ٠,٧٥$ ؛ $٣٠ - ٢٨ = ٢$ ، $٢٠ - ٢٠ = ٠$

ج $\frac{٧}{٨} \longrightarrow ٨\overline{)٧,٠٠٠} = ٠,٨٧٥$ ؛ $٧٠ - ٦٤ = ٦$ ، $٦٠ - ٥٦ = ٤$ ، $٤٠ - ٤٠ = ٠$

دەتوانی دووبارە ئامێری بژمێر بەکاربێنی بۆ نووسینی کەرتەکان لەسەر شێوەی ژمارەی دەیی.

$\frac{٢}{٥}$ = ٢ ÷ ٥ = ٠,٤

## ساغبکەوە

**١** ڕوونبکەوە چۆن دەزانی کە $\frac{١}{٤}$ و ٠,٢٥ هاوتان.

**کەرتەکە لەسەر شێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.**

**٢** $\frac{٢}{١٠}$ **٣** $\frac{٣}{٥}$ **٤** $\frac{٣}{٨}$ **٥** $\frac{٤}{٨}$ **٦** $\frac{٦}{١٠}$ **٧** $\frac{٣}{٢٠}$

## ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

**کەرتەکە لەسەر شێوەی دەیی بنووسە.**

**٨** $\frac{٧}{١٠}$ **٩** $\frac{٢٣}{٢٥}$ **١٠** $\frac{٧}{١٦}$ **١١** $\frac{٢}{٥}$ **١٢** $\frac{٢}{٤}$ **١٣** $\frac{٢}{٨}$

**١٤** $\frac{٣}{١٠}$ **١٥** $\frac{١٧}{٢٠}$ **١٦** $\frac{٥}{٨}$ **١٧** $\frac{١}{٨}$ **١٨** $\frac{٤}{٥}$ **١٩** $\frac{٦}{٨}$

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** ئەستوونی ڕوونکردنەوەییەکان بۆ شیکاری پرسیاری ٢٠ تا ٢٣ بەکاربهێنە.






**٢٠** ژمارەی ئەو قوتابیانە چەندە کەچالاکییان هەیە لە قوتابخانەکەدا؟

**٢١** کەرتێك بنووسە بۆئەوانەی چالاکی هۆنراوەیان هەیە پاشان کەرتەکە بەشێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.

**٢٢** کەرتێك بنووسە ئەوانە بنوێنێ کە چالاکی لە شانۆ و وێنە دەکەن و ئەو کەرتە بەشێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.

**٢٣** ئەگەر تەنها ١٥ قوتابی کاری وەرزشی بکەن. ئەو کەرتە دەبێتە چەند بۆ نواندنی ئەوانەی وەرزش ناکەن. ئەو کەرتە لەسەر شێوەی ژمارەی دەیی بنووسە.

**٢٤** کاوە ماوەی $\frac{٦}{٢٥}$کم لە خولەکێکدا دەبڕێ بەڵام کاردۆ ماوەی ٠,٢١کم لە خولەکێکدا دەبڕێ. کامیان خێراترن. وەڵامەکەت لێکبدەرەوە.

**٢٥** کەرتێکی هاوتا بۆ ژمارەیەکی دەیی گەورەتر لە ٠,٥ و بچووکتر لە ٠,٧٥ بنووسە.

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٦** ژمارەکان لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە.

٦,٠٠١ ؛ ٦,١٠١ ؛ ٦,٠١٠

**٢٧** کانی ماوەی ٤٠م ی لە ماڵەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بڕی. پاشان ٢٠م بەرەو باکور و ٣٠م بەرەو ڕۆژئاوا، و ٢٠م بەرەو باشور، ئەو ماوەیە چەندە کە ئێستا کەوتۆتە نێوان کانی و ماڵەوەیان؟

**٢٨** ٦٢١٣ × ٥٢

**٢٩** ١ ٥٥٩ × ٢٧٤

**٣٠** (ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە) ئەنجامی دابەشکردنی ٦٢ ٣٢٠ ÷ ٨٢ کامەیە؟

أ ٨٢ ب ٧٦٠ ج ٧ ٦٩١ د ٧٠ ١٩٦

وانەی ٤

# شێوازەکان لە دابەشکردندا

## Patterns Division



### پێداچوونەوەی خێرا

ئەنجامی لێکدان بدۆزەوە. پاشان ڕاستی دابەشکردنە پەیوەندیدارەکە بنووسە.

١ ٧×٩ ٢ ٩×٨

٣ ٤×٩ ٤ ٧×٤

٥ ٧×١٠

### فێربە

**بگە بەو ژمارە دەیییە بگە** تەماشای شێوازەکان لە هاوکێشەکانی لێکدان بکە. پاشان تەماشای شێوازەکان لە هاوکێشەکانی دابەشکردنی پەیوەندیداربکە.



### نموونە

| کۆلکە | × | کۆلکە | = | ئەنجامی لێکدان | | بەشکراو | ÷ | بەشدراو | = | ئەنجامی دابەشکردن |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٢ | × | ٤ | = | ٤٨ | ⟵ | ٤٨ | ÷ | ١٢ | = | ٤ |
| ١,٢ | × | ٤ | = | ٤,٨ | ⟵ | ٤,٨ | ÷ | ١,٢ | = | ٤ |
| ٠,١٢ | × | ٤ | = | ٠,٤٨ | ⟵ | ٠,٤٨ | ÷ | ٠,١٢ | = | ٤ |

(هاوکێشەکانی لێکدان — هاوکێشەکانی دابەشکردنی پەیوەندیدار)

لە هاوکێشەکانی لێکداندا. لە ئەنجامی لێکداندا چی ڕوودەدات کاتێك فاریزەکە بۆ لای چەپ لە کۆلکەیەکدا دەگوێزینەوە؟

چی دەبینی لە ئەنجامی دابەشکردن لە هاوکیشەکانی دابەشکردن

**لەبیرت نەچێ** دەتوانی لێکدان و شێوازەکان بەکاربهێنی بۆ دیاریکردنی ئەنجامی دابەشکردن لە دابەشکردنی ژمارە دەیییەکان.

**لەبیرت بێ**

هەر ژمارەیە

١٠ = ١٠ × ١

١,٠ = ١٠ × ٠,١

٠,١٠ = ١٠ ×٠,٠١

٠,٠١٠ = ١٠ × ٠,٠٠١

### نموونەی زیاتر

**أ** دابەشبکە ٠,٣٥ ÷ ٠,٠٥

٥ ×٧ = ٣٥ ⟵ ٣٥ ÷ ٥ = ٧

٠,٥ ×٧ = ٣,٥ ⟵ ٣,٥ ÷ ٠,٥ = ٧

٠,٠٥ × ٧ = ٠,٣٥ ⟵ ٠,٣٥ ÷ ٠,٠٥ = ٧

کەواتە، ٠,٣٥ ÷ ٠,٠٥ = ٧.

**ب** دابەشبکە ٠,٥٦ ÷ ٠,٠٧

٧ × ٨ = ٥٦ ⟵ ٥٦ ÷ ٧ = ٨

٠,٧ × ٨ = ٥,٦ ⟵ ٥,٦ ÷ ٠,٧ = ٨

٠,٠٧ × ٨ = ٠,٥٦ ⟵ ٠,٥٦ ÷ ٠,٠٧ = ٨

کەواتە، ٠,٥٦ ÷ ٠,٠٧ = ٨.

### ساغبکەوە

**١** هاوکێشەکانی لێکدان کە بەکاریدەهێنی بۆ دابەشکردنی ٠,٤٨ ÷ ١,٢ دیاربکە.

هەر شێوازێك بۆ لێکدان کۆپی بکە و تەواوی بکە، پاشان شێوازی دابەشکردنی پەیوەندیدار بنووسە.

**٢** ٦ × ٩ = ٥٤
٠,٦ × ٩ = ▢
٠,٠٦ × ٩ = ▢

**٣** ١٥ × ٥ = ٧٥
١,٥ × ٥ = ▢
٠,١٥ × ٥ = ▢

**٤** ١٦ × ٤ = ٦٤
١,٦ × ٤ = ▢
٠,١٦ × ٤ = ▢

## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

هەر شێوازێك بۆ لێکدان کۆپیبکە و تەواوبکە. پاشان شێوازی دابەشکردنی پەیوەندیدار بنووسە.

**٥** ٢١ = ٣ × ٧
■ = ٣ × ٠,٧
■ = ٣ × ٠,٠٧

**٦** ٥٦٧ = ٧ × ٨١
■ = ٧ × ٨,١
■ = ٧ × ٠,٨١

**٧** ١٠٤ = ٤ × ٢٦
■ = ٤ × ٢,٦
■ = ٤ × ٠,٢٦

**٨** ١٠ = ٢ × ٥
■ = ٢ × ٠,٥
■ = ٢ × ٠,٠٥

**٩** ١٧٥ = ٥ × ٣٥
■ = ٥ × ٣,٥
■ = ٥ × ٠,٣٥

**١٠** ٤٥٦ = ٨ × ٥٧
■ = ٨ × ٥,٧
■ = ٨ × ٠,٥٧

هەر شێوازێکی دابەشکردن تەواوبکە.

**١١** ٢ = ٢٥ ÷ ٥٠
■ = ٢,٥ ÷ ٥,٠
■ = ٠,٢٥ ÷ ٠,٥٠

**١٢** ٥ = ١٥ ÷ ٧٥
■ = ١,٥ ÷ ٧,٥
■ = ٠,١٥ ÷ ٠,٧٥

**١٣** ١٢ = ١٢ ÷ ١٤٤
■ = ١,٢ ÷ ١٤,٤
■ = ٠,١٢ ÷ ١,٤٤

**١٤** ٩٠ = ٤ ÷ ٣٦٠
■ = ٠,٤ ÷ ٣٦,٠
■ = ٠,٠٤ ÷ ٣,٦٠

**١٥** ٨ = ٩ ÷ ٧٢
٨ = ■ ÷ ٧,٢
٨ = ■ ÷ ٠,٧٢

**١٦** ٣ = ٤٠ ÷ ١٢٠
٣ = ■ ÷ ١٢
٣ = ■ ÷ ١,٢

**جەبر** ڕاستیە بنەڕەتیەکان و شێوازەکان بەکاربهێنە بۆ دۆزینەوەی بەهای ی.

**١٧** ی = ٠,٠٣ ÷ ٠,٠٩
**١٨** ی = ٠,٠٤ ÷ ٠,١٦
**١٩** ی = ٠,٠٥ ÷ ٣,٠
**٢٠** ٢ = ی ÷ ١,٦
**٢١** ٧ = ٠,٠٢ ÷ ی
**٢٢** ٩ = ی ÷ ٠,٨١

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بۆ شیکاری پرسیاری ٢٣ تا ٢٥ بەکاربهێنە.



| خاوترین گیانەوەرا لەسەر زەوی | |
|---|---|
| گیانەوەران | خێرایی (کم/ك) |
| کرمە لیقە | ٠,٠٣ |
| مەیموونی تەمبەڵ | ٠,١٥ |
| کیسەڵی زەبەلاح | ٠,١٧ |

**٢٣** ئەو کاتە چەندە کە کرمە لیقە پێویستیەتی بۆ بڕینی ٠,٩ کیلۆمەتر؟

**٢٤** ئەو کاتە چەندە کە کیسەڵێك پێویستێتی بۆ بڕینی ١,٧کم؟

**٢٥** کام یەك لەم دوو گیانەوەرانە پێشدەکەوێت بۆ بڕینی ١کم، کرمە لیقە یان مەیمونی تەمبەڵ.

**٢٦** **هەڵە لەکوێیە؟** ئاراس ئەڵێ ئەنجامی دابەشکردنی ٧,٥ بەسەر ٠,٠٥ دا بریتییە لە ١ ٥٠٠ هەڵەی ئاراس لەکوێیە؟

**٢٧** **مانای ژمارە** کامیان گەورەترە؟

أ ٠,١٢ ÷ ٠,٤ یان ٠,١٢ ÷ ٠,٠٤؟

ب ٠,٤ ÷ ٠,٢ یان ٠,٠٠٤ ÷ ٠,٠٢؟

### پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە

**٢٨** ٩٨٤ ٦٥ ÷ ٤٤

**٢٩** ٨٦١ ٢٩٤ ÷ ٩٨

**٣٠** بەهای ن بدۆزەوە لە ن × ٥ = ٤٥

**٣١** ٣,٢؛ ٤,٦؛ ٢,٣؛ ٦,٤؛ ٣,٢؛ ٤,٦. لەم پێدراوانەدا مۆد کامەیە.

**٣٢** خێڵان ٢٠ ملوانکەی هەیە، لەهەر ملوانکەیەکدا ٢٥ مورو هەیە، ملوانکەیەکی دابە خوشکەکەی. چەند مورووی لاماوە؟

أ ٤٢٥
ب ٤٧٠
ج ٤٧٥
د ٤٨٠

وانەی ٥

# دابەشکردنی دەیی

## Decimal Division

### پێداچوونەوەی خێرا

١ ٦٣,٩ ÷ ٩
٢ ٣٢,٨ ÷ ٨
٣ ٢٥,٧٥ ÷ ٥
٤ ١٦,٨ ÷ ٤
٥ ٦٣,٩ ÷ ٣

### فێربە

**پیتزا بە جاترە** لوبنان بەناوبانگە بە دروستکردن و ڕاراندنەوەی پیتزا بە زەیت و جاترە. وە ئیتاڵیا بەناوبانگە بە پیتزا ئەویش تێکەڵە لە زۆر شت وەك بەهارات و پەنیر و دۆشاوی تەماتە و قارچك و بیبەر و پیاز و جاترە و زەیتون.

دایکی ڕزگار حەزی لە پیتزای پەنیر و جاترەیە، لەدروستکردنیدا ١,٤گرام پەنیر بەکاردەهێنێ بەرامبەر ٠,٧گرام جاترە. چەند گرام پەنیری پێویستە ئەگەر ١ گرام جاترە بەکاربهێنێ؟



▲ پیتزای جاترە لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە بڵاوبووەوە لە ئیتاڵیا سەریهەڵدا.

### نموونە

دابەشبکە ١,٤ ÷ ٠,٧

بیربکەوە ١,٤٠ و ١,٤ دوو ژمارەی دەیی هاوتان.

**ڕێگای یەکەم**

**نموونەیەك بەکاربهێنە بۆ دیاریکردنی ئەنجامی دابەشکردن**




#### لەبیرت بێ

کاتێك لە ١٠ یان لە ١٠٠ ئەدەیت بەپێی ژمارەی سفرەکان فاریزەکە بەرەولای ڕاست دەجووڵێنی

٠,٣٢ × ١٠ =٣,٢
٠,٣٢ × ١٠٠ =٣٢

**ڕێگای دووەم** بۆ دابەشکردنی ژمارەیەکی دەیی بەسەر ژمارەیەکی دەیی تردا بەشدراو بگۆڕە بۆ ژمارەیەکی سروشتی. بەشکراو بەشدراو لە ١٠ یان لە ١٠٠ یان زیاتربدە. کاتێك بەشکراو لەگەڵ بەشدراو پێکەوە لەیەك ژمارە ئەدەی. ئەنجامی دابەشکردن وەك خۆی دەمێنێتەوە.

**هەنگاوی ١**

لە ٠,٧ یەك خانەی دەیی هەیە. کەواتە، گۆڕینی بۆ ژمارەیەکی سروشتی لە ١٠ی دەدەیت.

٠,٧ × ١٠ = ٧

بەشکراو و بەشدراو لە ١٠ بدە.

٠,٧⟌١,٤

**هەنگاوی ٢**

فاریزەکە لە ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ لەسەرووی فاریزەی بەشکراوەکە

٧,⟌١٤,

دابەشبکە وەك ئەوەی ژمارەکان سروشتی بن

$$\begin{array}{r} ٢,٠ \\ ٧\overline{)١٤,٠} \\ -\ ١٤ \\ \hline ٠ \end{array}$$

کەواتە، ٢گرام لە پەنیر بەکاردەهێنێت ئەگەر ١گرام لە جاترە دابنێ.



## ژمارە سروشتیەکان و ژمارە دەیییەکان

**لەبیرت نەچێ** بۆ دابەشکردنی ژمارەیەك بەسەر ژمارەیەکی دەیی. بەشدراو بگۆڕە بۆ ژمارەیەکی سروشتی بە لێکدانی بەشکراو و بەشدراو پێکەوە لە ١٠ یان ١٠٠ یان ١٠٠٠.

دایکی بێژان بوتڵێك لە هاڕاوەی ڤانیلیا کڕی بارستاییەکەی ٢٥٨گم بۆ ئامادەکردنی قالبێك شیرینی، هەر کەوچکێکی بچووك لە هاڕاوەی ڤانیلیا بەرامبەر ٥,١٦گم. چەند کەوچکی بچووك لە ڤانیلیا لە بوتڵێکی ٢٥٨گم هەیە؟

### نموونە

دابەشبکە ٢٥٨ ÷ ٥,١٦

**هەنگاوی ١**

لە ٥,١٦ دوو خانەی دەیی هەیە بۆ گۆڕینی بەشدراو بۆ ژمارەی سروشتی. هەریەك لە بەشدراو و بەشکراو لە ١٠٠ بدە.

٥,١٦ ⟌ ٢٥٨٠٠ ← فاریزەکە لە بەشکراو دابنێ دەتوانی سفری زیادە لەلای ڕاستی فاریزەکە زیادبکەی بێ ئەوەی بەهای ژمارەکە بگۆڕێ

**هەنگاوی ٢**

٥١٦ ⟌ ٢٥٨٠٠, = ٥٠,
٢٥٨٠٠ −
٠٠٠٠٠

فاریزەکە لە ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ.

وا دابەشبکە وەك ئەوەی ژمارەکان سروشتی بن.

کەواتە، ٥٠ کەوچکی بچووك لە بوتڵێکی ٢٥٨ گم دا هەیە.

### نموونەی زیاتر

**أ** دابەشبکە٦ ÷ ٠,٠٢٥

٠,٠٢٥ ⟌ ٦,٠٠٠ ← فاریزەکە لە بەشکراو دابنێ، بەشدراو بگۆڕە بۆ ژمارەی سروشتی.

٢٥ ⟌ ٦٠٠٠, = ٢٤٠,
٥٠ −
١٠٠
١٠٠ −
٠

**ب** دابەشبکە ٦,٦٤ ÷ ٠,٠٨

٠,٠٨ ⟌ ٦,٦٤ ← بەشدراو بگۆڕە بۆ ژمارەی سروشتی بە لێکدانی بەشکراو بەشدراو لە ١٠٠

٨ ⟌ ٦٦٤, = ٨٣,
٦٤ −
٠٢٤
٢٤ −
٠

**ج** دابەشبکە ٢,٠٨ ÷ ٠,٤

٠,٤ ⟌ ٢,٠٨ ← بەشدراو بگۆڕە بۆ ژمارەیەکی سروشتی، بەلێکدانی بەشدراو لە ١٠.

٤,٠ ⟌ ٢٠,٨ = ٥,٢
٢٠ −
٠٨
٨ −
٠

## ساغبکەوە

**١** **ڕوونبکەوە** چۆن دەزانی کە پێویستە لەسەرت فاریزەکە لە بەشدراوەکە خانەیەك یان دوو خانە بگوێزرێتەوە.

**پرسیارەکە کۆپی بکە. فاریزەکە لە ئەنجامی دابەشکردنەکە دابنێ، تیراسا بۆ یارمەتی بکێشە.**

**٢** ٠,٢ ⟌ ٢,٦ = ١ ٣

**٣** ٠,١٦ ⟌ ١,٩٢ = ١٢

**٤** ٠,٥ ⟌ ١,١٥ = ٢٣

**٥** ٠,٢٨ ⟌ ١,١٢ = ٤

## راهێنان و شیکاری پرسیارەکان

پرسیارەکە کۆپی بکە. فاریزەکە لە ئەنجامی دابەشکردنەکەدا دابنێ.

**٦** ٠,٢⟌٢,١٢ = ١٠٦

**٧** ٠,٧⟌٨,٠٥ = ١١٥

**٨** ٠,٢٥⟌٠,٢٢٥ = ٠٩

**٩** ٣,٤⟌٤٦,٥١٢ = ١٣٦٨

**١٠** ٠,٧⟌٥,٣٢ = ٧٦

**١١** ٠,٠٨⟌٠,٥٤٤ = ٦٨

دابەشبکە.

**١٢** ٠,٤⟌٦

**١٣** ١,٦⟌١٨,١١٢

**١٤** ٠,٠٧⟌٠,٨٤

**١٥** ٠,٥٢⟌٦,٢٤

**١٦** ٠,٠٧⟌١,٣٣

**١٧** ٠,٣٥⟌٥,٢٥

**١٨** ١,٧⟌٥,٤٤

**١٩** ٠,٢٥⟌١٢

**٢٠** ٢,١ ÷ ٧١,٤

**٢١** ١,٢ ÷ ٤٢

**٢٢** ٠,٧ ÷ ٥,٢٥

**٢٣** ٠,١٤ ÷ ٠,٤٢

**٢٤** ٠,٥ ÷ ٢٥

**٢٥** ٣,٤ ÷ ٠,٣٤

**٢٦** ٠,٤ ÷ ٠,٦٤

**٢٧** ١,٥٠ ÷ ٩,٠٠

**شێوازەکان** دابەشبکە، پاشان شێوازەکە لە ئەنجامی دابەشکردنەکە ڕوونبکەوە.

**٢٨** أ ١,٢ ÷ ٦,٦  ب ٠,١٢ ÷ ٦,٦  ج ٠,٠١٢ ÷ ٦,٦

**٢٩** أ ٢,٥ ÷ ٧,٥  ب ٢,٥ ÷ ٠,٧٥  ج ٢,٥ ÷ ٠,٠٧٥

**بەکارهێنانی پێدراوەکان** خشتەکە بەکاربهێنە بۆ شیکاری پرسیاری ٣٦ تا ٣٨.

**بڕی بچووک**

| بڕەکە | فراوانی (ملل) |
| --- | --- |
| دڵۆپە ئاو | ٠,٢٢ |
| کەوچکی بچووک | ٤,٣ |
| کەوچکی گەورە | ١٢,٢٥ |
| کوپێك قاوە | ٨٢,٧ |
| کوپێك چا | ٢١٥ |

**٣٠** نزیکەی چەند دڵۆپە ئاو کەوچکێکی بچووک پڕدەکا؟

**٣١** **پرسیار چییە؟** وەڵام نزیکەی ٥ دڵۆپە؟

**٣٢** ئەم بڕانەی خوارەوە لە بچووکەوە بۆ گەورە ڕیزبکە. ٣ کەوچکی گەورە، نیو کوپ قاوە، $\frac{1}{6}$ کوپ چا.

**٣٣** **ڕێنوێنی** بڕی ٦,٠٢ ÷ ٠,٢ت هەیە ئەگەر بەشکراوت لە ١٠٠ دا و بەشدراویش لە ١٠، ئایا ئەنجامی دابەشکردنەکە وەك خۆی دەمینێتەوە؟ ئەمە ڕونبکەوە.

**٣٤** **هەڵە لەکوێدایە؟** کەنار ٧,٢٥ بەسەر ٠,٢٥ دا دابەشکرد، ئەنجامی دابەشکردنی یەکسانبوو بە٠,٢٩. هەڵەکە دیاربکە و ڕاستبکەوە.

**٣٥** **ڕێنوێنی** ئەگەر ٧,٥٦ دابەشبکەی بەسەر ٧,٦. ئایا ئەنجامی دابەشکردنەکە گەورەترە یان بچووکترە لە ١، وەڵامەکەت ڕوونبکەوە.

**٣٦** كامیان قورسترە، دوو كاڵەك بارستاییان پێكەوە ٢١,٧٥كیلۆگرام بێ یان ١٥ كاڵەكی زەرد كە بارستایی هەریەكەیان ١,٥كیلۆگرام بێت؟

**٣٧** دوو بوتڵی گەورەت هەیە فراوانی هەر یەكیان ١,٧٥ لترە، هەردووكیان چەند بوتڵی بچووك پڕ دەكەن ئەگەر فراوانی بوتڵێكی بچووك ٠,٢٥لتر بێت؟

## پێداچوونەوە و ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە

**٣٨** ٣٠٩ × ٨

**٣٩** ٨٤٦٧٠٥ × ٣

**٤٠** ٠,٠٨١ ÷ ٩

**٤١** ٨٥,٦٣٩ × ٢,٥

**٤٢** س + (٧ × ١٤) ئەژمێربكە كە س = ٣٣

**٤٣** سەپان ٩ كاتژمێر كاری زیادەی كرد لە هەفتەیەكدا، شاهۆ ١ كاتژمێر و شاسوار ٢ كاتژمێر، دیار ٤ كاتژمێر. چ جۆرە وێنە ڕوونكردنەوەییەك باشترە بۆ پیشاندانی ژمارەی كاتژمێرە زیادەكانی ئەو كەسانەی كاریانكردووە؟

**٤٤** (ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە) بەهای ڕەنووسی ٨ لە ژمارە ٥,٦٨١ چەندە؟

أ ٨ یەكان

ب ٨ دەیەكی

ج ٨ بەش لەسەد

د ٨ بەش لەهەزار

**بەكارهێنانی پێدراوەكان** خشتەكە بۆ شیكاری پرسیاری ٥١ و ٥٢ بەكاربهێنە.

| ئەنجامی یاریەكانی تۆپی سەبەتە | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| یاری | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ |
| ژمارەی خاڵ | ٨٥ | ٩٧ | ٨٢ | ٧٣ | ٧٦ |

**٤٥** ناوەندی خاڵەكانی تیپی تۆپی سەبەتەچەندە؟

**٤٦** مەودا و ناوەڕاستە و مۆد بۆئەم خاڵانە چەندە؟

**٤٧** (ئامادەبوون بۆ تاقیكردنەوە) بنار دوو مریشكی كڕی بە ١٢ ٥٠٠ دینار، ئەگەر نرخی ١ كگم مریشك ٢ ٠٠٠ دینار بێ، ئایا چەند كیلۆگرامی كڕیوە؟

أ ٦,٢٥ كگم

ب ١٠,٥٨ كگم

ج ١٤,٥٨ كگم

د ٢٥,١٦ كگم

# شیكاری پرسیارەكان



# گۆشەی ڕووناكبیران

**هەڵوەشاندنەوەی نهێنییەكان** ئایا دەتوانی كە هێمای نهێنییەكان هەڵبوەشێنیت. كلیلی ئەم مەتەڵە لەلای چەپە. ژمارەكان بەشێوەی ئەو هێڵانە دەنوێنرێت كە چواردەورەی داوە. ژمارە ٣ بە شێوەی ┘ دەنوێندرێ،

| ٣ | ٢ | ١ |
|---|---|---|
| ٦ | ٥ | ٤ |
| ٩ | ٨ | ٧ |

**نموونە** بدۆزەوە □┌ ÷ □⊔

┌ = ٧ و □ = ٥ ⟵ ┌,□ = ٧,٥ ⊔ = ٢ و □ = ٥ ⟵ □,⊔ = ٢,٥

٧,٥ ÷ ٢,٥ = ٣

كەواتە، □,┌ ÷ □,⊔ = ٣

**پرسیارەكە هەڵبوەشێنە پاشان شیكاریكە. وەڵامەكە بە ڕەنووس بنووسە.**

**١** └,⊔÷└⊏,⊏

**٢** ⊔,⊏÷└┐,⊔

**٣** ⊓×□,┘

**٤** └⊓,⊏–⊏□,⊐

**٥** └,⊐÷□,└⊔

**٦** ┐,┘÷┘└,⊐⊔

**٧** ١٢ ÷ ١,٥ ئەژمێربكە، پاشان پرسیارەكە بنووسە، و ئەنجامی دابەشكردنەكە بەهێما بنووسە.



وانەی ٦

# کارامەییەکانی شیکاری پرسیارەکان

## هەڵبژاردنی کردارێك

# Problem Solving Skills

## Choosing the operation

تێبگە ‌ پلاندانێ ‌ شیکاربکە ‌ ساغبکەوە



**پێداچوونەوەی خێرا**

١. ٢٣,٠٦ + ٤,٥

٢. ٣٩,٠٥ − ٦,١

٣. ٥,٢٥ × ٤

٤. ٥٥,٥ ÷ ٠,٥

٥. (٢,٥ × ١٠) −٧

قورسی جەستە دەگۆڕێ ئەگەر لە زەویەوە بچێتە مەریخ، بەڵام بارستاییەکە ناگۆڕێ، بۆیە زانا فیزیاییەکان کێش و بارستایی لێك جیادەکەنەوە، بارستایی بەکیلۆگرام دەپێون. وە کێش بە نیوتن.

ئەم خشتەیە ئەوە دەردەخات کە کێشی جەستەیەك لەسەر هەر هەسارەیەك چەندە ئەگەر کێشی لەسەر زەوی ١ نیوتن بێ.

**لەبیرت نەچێ** ئەو پەیوەندییەی کەژمارەی ناو پرسیارەکان بەیەکەوە دەبەستێت یارمەتی دەدات بۆ هەڵبژاردنی کردارە گونجاوەکە بۆ شیکاری پرسیارەکە.

**نیوتنی زەوی لە بۆشایی ئاسمان**

| هەسارە | کێش (نیوتن) |
|---|---|
| عەتارد | ٠,٣٨ |
| زوهرە | ٠,٩١ |
| زەوی | ١ |
| مەریخ | ٠,٣٨ |
| مشتەری | ٢,٥٣ |
| زوحەل | ١,٠٧ |
| ئۆرانوس | ٠,٩٠ |
| نیپتۆن | ١,١٠ |
| بلۆتۆ | ٠,٠٧ |

**بڕوانە ئەو پەیوەندیەی کە ژمارەکان لە پرسیارەکە بەیەکەوە دەبەستێت، پاشان کردارە گونجاوەکە بۆ شیکاری پرسیارەکە هەڵبژێرە و شیکار بکە.**

| | |
|---|---|
| کۆکردنەوە | خستنە پاڵیەکی کۆمەڵەکان |
| لێدەرکردن | سڕینەوە یان بەراوردکردنی کۆمەڵەکان |
| لێکدان | خستنە پاڵیەکی کۆمەڵە یەکسانەکان |
| دابەشکردن | بەشینەوە بەسەر کۆمەڵە یەکسانەکان، دیاریکردنی بڕە لەهەر کۆمەڵەیەك. |

أ. ئەگەر کێشی کاڵەکێك لەسەر زەوی ٦٨ نیوتن بێت، کێشەکەی لەسەر مشتەری چەندە؟

ب. ئەگەر کێشی غۆرێلایەك لەسەر هەسارەی پلۆتۆ ١٤٩,٨ نیوتن بێت. کێشی لەسەر زەوی چەندە.

ج. کێشی تۆپێکی تێنسی سەرزەوی لەسەر ڕووی زەوی ١ نیوتنە کێشەکەی لەسەر مشتەری چەندی لەکێشی سەرزەوی زیاترە؟

د. دوو مشك کێشی هەریەکیان لەسەر زەوی ١ نیوتنە. کێشی هەردووکیان لەسەر عەتارد چەندە؟



**باسبکە**

- ڕوونبکەوە چۆن بڕیارتدا کرداری گونجاو بۆ شیکاری هەر پرسارێك هەڵبژێری؟
- ئەگەر کێشی ئەو غورێلایەی کە لە پرسیاری (ب)دا هاتووە ٧٤,٩ نیوتن بێت لەسەر پلۆتۆ، کێشەکەی لەسەر زەوی چەندە؟

## ◄ ڕاهێنان و شیکاری پرسیارەکان

شیکاریکە. کردارەکە یان کردارەکان کە بەکارتهێناوە دیاری بکە.

خشتەکەی لاپەڕەی پێشوو بۆ شیکاری پرسیاری ١، ٢ بەکاربهێنە.

١ ئەهەنگی شین کێشەکەی لەسەر زەوی ٨٣٠ ٢٩٨ ١ نیوتنە، کێشەکەی لەسەر مەریخ چەندە؟

٢ پڵنگێك کێشەکەی لەسەر نیبتۆن ٣ ٢٠٩,٨ نیوتنە، کێشەکەی لەسەر زەوی چەندە؟

٣ ورچێکی جەمسەری کێشەکەی ٥ ٨٤٠ نیوتنە و ئەهەنگێکیش کێشەکەی ٦ ٦٣٥ نیوتنە، کێشی ئەهەنگەکە چەندی لە ورچەکە زیاترە؟

٤ سێ لە ورچی پاندای زەبەلاح کێشیان پێکەوە ٤ ٦٦٢ نیوتنە، ناوەندەی کێشی ورچێك چەندە؟

لە ساڵی ١٩٩٩ زۆرترین ژمارە لە گیانەوەران ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان کران. بە کەشتی ئاسمانی (کۆڵۆمبیا) ١ ٥٠٠ سیسرك و ١٨ مشك و ١٥٢ جرج و ١٣٥ کرمە لیقە و ٤ ماسیە بۆقە و ٢٢٩ ماسی ڕووبار ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان کران.



► سەگی لایکا یەکەمین گیانەوەر بوو کە بە کەشتی ئاسمانی سپۆتنیك ٢ لە ساڵی ١٩٥٧ ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان کرا.

٥ کام کردار بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی ژمارەی گشتی گیانەوەرەکان لەم گەشتەدا؟

| | |
|---|---|
| أ لێکدان | ج لێدەرکردن |
| ب دابەشکردن | د کۆکردنەوە |

٦ ژمارەی سیسرکەکان چەندی لە سەرجەمی گیانەوەرانی تر زیاترە؟

| | |
|---|---|
| أ ٥٣٨ | ج ٩٦٢ |
| ب ٨٧٢ | د ١٥٠٠ |

## ڕاهێنان لەسەر ڕێگا جیاوازەکان

### بەکارهێنانی پێدراوەکان

ستوونە ڕوونکردنەوەییەکان بۆ شیکاری پرسیاری ٧ ، ٨ بەکاربهێنە.




٧ جیاوازی لەنێوان خێراترین و هێواشترین ماسی لەوێنەکەدا چەندە؟

٨ ماسی هەرمێی چەند کاتی دەوێ بۆ بڕینی ماوەی ١ ٠٠٠ کم؟

٩ **پرسیار بنووسە**

پێدراوە هاتووەکانی ناو وێنەی ڕوونکردنەوەییەکە بەکاربهێنە.

١٠ نەبیل بۆ پەیوەندییەکی تەلەفۆنی ١ ٠٠٠ دیناری بۆ دە خولەکی یەکەم داو ٢٥٠ دینار بۆهەر خولەکێکی زیادە. ئەگەر ماوەی گفتوگۆ تەلەفۆنیەکە ٢٠ خولەك بخایەنێت، بڕی پارەی پەیوەندییەکە چەندە؟

# پێداچوونەوە
# Review

## دڵنیابوون لە زاراوەکان و چەمکەکان

| |
|---|
| فاریزە decimal point |
| لێکدان multiplication |
| ئەنجامی دابەشکردن quotient |
| ژمارەی سروشتی natural number |

دەربڕینی گونجاو لە لیستەکەدا هەڵبژێرە.

**١** بۆ دابەشکردن بەسەر ژمارەیەکی دەیی، بەشدراو دەگۆڕین بۆ ___؟___ .

**٢** بۆ دیاریکردنی ئەنجامی دابەشکردنی لە دابەشکردنی دەییەکان هاوکێشەکانی ___؟___ پەیوەندیدار بەو بەکاردێت.

## دڵنیابوون لە کارامەییەکان

ئەنجامی دابەشکردنەکە بدۆزەرەوە. لێکدان بەکاربهێنە بۆ ساغکردنەوە.

**٣** ٨⟌٧,٢　**٤** ٧⟌٥,٦　**٥** ٩⟌٠,٨١　**٦** ٢⟌٣,٦٦

**٧** ٨ ÷ ٢١٨,٤　**٨** ٩ ÷ ٥٧١٦,٨　**٩** ٩ ÷ ٢٨,٤٤　**١٠** ٥ ÷ ٥٨,٧٥

کەرتەکە لەسەر شێوەی دەیی بنووسە.

**١١** $\frac{٤}{١٦}$　**١٢** $\frac{٥}{٢٥}$　**١٣** $\frac{٦}{٢٤}$　**١٤** $\frac{٧}{١٦}$

هەر شێوازێکی دابەش تەواوبکە.

**١٥** ١٧ = ١٢ ÷ ٢٠٤　**١٦** ٧٢ = ٣ ÷ ٢١٦　**١٧** ٦ = ٧٠ ÷ ٤٢٠

■ = ١,٢ ÷ ٢٠,٤　■ = ٠,٣ ÷ ٢١,٦　٦ = ■ ÷ ٤٢,٠

■ = ٠,١٢ ÷ ٢,٠٤　٧٢ = ■ ÷ ٢,١٦　٦ = ■ ÷ ٤,٢

ڕاستیە بنەڕەتییەکان و شێوازەکان بۆ دۆزینەوەی بەهای س بەکاربهێنە.

**١٨** س = ٠,٨ ÷ ٥,٦　**١٩** س = ٠,٦ ÷ ١,٨　**٢٠** ٣٠ = س ÷ ٠,٩٠

دابەشبکە.

**٢١** ٠,٥⟌٤,٥　**٢٢** ٠,٢٨⟌١,٤٠　**٢٣** ٠,٠٣⟌١,٥٦٦　**٢٤** ٤,٥ ÷ ٥٤

## دڵنیابوون لە شیکاری پرسیارەکان

شیکاریکە. کردارێك یان کردارەکان کە بەکاری دەهێنی دیاریکە.

**٢٥** هۆڵێکی گەورە پانیەکەی ١٦,٨٧م و درێژیەکەی ١٩,٥٤م، درێژیەکەی چەندی لە پانیەکەی زیاترە؟

**٢٦** ئازاد ٤,٢٥کم لە هەفتەیەکدا بەپێ دەبڕێت. ئەو ماوەیە چەندە کەبە ١٥ هەفتە دەیبڕێت؟

**٢٧** چەند بوتڵێکی ئاو فراوانیان ٤,٥٠لترە، ئەگەر فراوانی یەك بوتڵ ١,٥٠لتر بێت. ژمارەی بوتڵەکان چەندە؟

**٢٨** هێرش ٢٢ هەزار دیناری لە بڕی ٤ کاتژمێر کاری زیادە وەرگرت. ئایا بڕی ١ کاتژمێر کاری زیادە چەند وەردەگرێت؟

# ئامادەبوون بۆ تاقیکردنەوە
## Standardized Test Prep




**وەڵام هەڵبژێرە**

سەیری پرسیاری ٥ بکە ئەگەر وەڵامەکەت نەگونجا لەگەڵ وەڵامەکان، لەکرداری ئەژمێرەکە خۆت دڵنیابکە، ئەگەر کرداری ئەژمێرەکە ڕاستبوو ئەوا وەڵامەکە دەوربدە «جگە لەوە».

**وەڵامی ڕاست لە شیکاری پرسیاری ١ تا ١٠ هەڵبژێرە.**

**١** شێوە دەیی بۆ کەرتی $\frac{٣}{٥}$ کامەیە؟

أ ٠,٣٥ ب ٠,٥٣ ج ٠,٦ د ٣,٥

**٢** بارستایی ٥ پاکەت ٤,٤٥ کگم. بارستایی ١ پاکەت چەندە؟

أ ٠,٩٤کگم ب ٠,٨٩کگم ج ٠,٨٥کگم د ٠,٨٠کگم

**٣** ٤ ÷ ٠,٢

أ ٥ ب ٢ ج ٠,٥ د ٠,٠٥

**٤** سەیران بایی ٣ ٧٥٠ دینار سێوی کڕی. ئەگەر نرخی ١کگم ٧٥٠ دینار بێ. چەند کیلۆگرامی کڕیوە؟

أ ٦ کگم ج ٥ کگم
ب ٥,٥ کگم د ٢,٨١ کگم

**٥** ٠,٤٥ ÷ ٠,٠٣

أ ٠,٠١٥ ب ١,٥ ج ٠,١٥ د جگە لەوە

**٦** هەڤاڵ ماوەی ٠,٩کم بە ١ کاتژمێر دەبڕێ. چەند کاتی دەوێ بۆ بڕینی ٠,٤٥کم؟

أ ٥ کاتژمێر ج ٠,٥ کاتژمێر
ب ٤,٠٥ کاتژمێر د ٠,٠٥ کاتژمێر

**٧** لە ڤیستیڤاڵی وەرزشدا تیپی تۆپی باسکە ئەم خاڵانەی تۆمارکرد، ٥٨، ٥٨، ٦٢، ٦٧، ٧٠ ناوەڕاستە چەندە؟

أ ٦٣ ب ٦٢ ج ٥٨ د ١٢

**خشتەکە بۆ شیکاری پرسیارەکانی ٨ تا ١٠ بەکاربهێنە.**

| ئەو وڵاتانەی کەزۆرترین ژمارە ئامێری ڤیدیۆیان هەیە | |
|---|---|
| وڵات | ژمارە |
| چین | ٤٠ ٠٠٠ ٠٠٠ |
| وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٨٦ ٨٢٥ ٠٠٠ |
| ئەڵمانیا | ٢٦ ٣٢٨ ٠٠٠ |
| ژاپۆن | ٣٤ ٣٠٩ ٠٠٠ |

**٨** کام کردار بەکاردێت بۆ ئەوەی دەیزانی ژمارەی ئامێری ڤیدیۆ لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا چەندی زیاترە لە ژمارەی ڤیدیۆکان لە ئەڵمانیا؟

أ کۆکردنەوە ب لێدەرکردن ج لێکدان د دابەشکردن

**٩** ژمارەی ئامێرەکانی ڤیدیۆ لەچین ویابان پێکەوە چەندن؟

أ ٧٤ ٣٠٩ ٠٠٠ ج ٧ ٤٣٠ ٩٠٠
ب ٥٦ ٩١٠ ٠٠٠ د ٥ ٦٩١ ٠٠٠

**١٠** ڕیزبەندی وڵاتەکان بەپێی ژمارەی ئامێرەکانی ڤیدیۆ لە کەمەوە بۆ زۆر کامەیە؟

أ وڵاتە یەکگرتووەکان، چین، ئەڵمانیا، ژاپۆن.
ب چین، ئەڵمانیا، وڵاتە یەکگرتووەکان، ژاپۆن.
ج ژاپۆن، ئەڵمانیا، چین، وڵاتە یەکگرتووەکان.
د ئەڵمانیا ژاپۆن، چین، وڵاتە یەکگرتووەکان.

## ئەوەی دەیزانی بینووسە — Write What You Know



**١١** دوو کەرت لەم کەرتانە $\frac{١}{٤}$، $\frac{١٢}{٥٠}$، $\frac{١٣}{٥٢}$ هاوتان، ڕوونبکەوە چۆن هەر کەرتێك بەشێوەی ژمارەی دەیی بۆ دۆزینەوەی دوو کەرتی هاوتا دەنووسیت.

**١٢** کوێستان پارچە قوماشێکی هەیە کە درێژیەکەی ١٠,٥ مەتر، پێویستی بە سێ پارچە هەیەکە درێژی هەریەکێکیان ١ مەتر، ویستی قوماشە ماوەکە بکات بەچەند پارچەیەکەوە کە درێژی هەریەکێکیان ١,٢٥ مەتر بێ. چەند پارچە قوماشی دەست دەکەوێت کە درێژی هەریەکەیان ١,٢٥ مەتر بێ ڕوونبکەوە، چۆن وەڵامەکەت دۆزییەوە.